پ.ی.د. عەبدولواحید موشیر دزەیی

# وشەسازی زمانی کوردی






چاپی دووەم ٢٠١٣

نــاوی کـتێب : وشەسازی زمانی کوردی
نووســینی : پ.ی.د.عەبدولواحید موشیر دزەیی
تــایپ: ساناو & سەهەند عەبدولواحید دزەیی
دیزاینی ناوەوە: یارا عەبدولواحید دزەیی
بەرگ : جمعە صدیق کاکە
نۆرە و ساڵی چاپ: دووەم ٢٠١٣
تیراژ : ١٥٠٠ دانە
نرخ : ٣٥٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٠٨٠) ی ساڵی ٢٠١٢ ی پێدراوە

تێبینی :

# وشەسازی
# زمانی کوردی

دانانی
پ.ی.د.عەبدولواحید موشیر دزەیی
بەشی کوردی/کۆلیژی زمان/زانکۆی سەلاحەددین/هەولێر

هەولێر ٢٠١٢

# لیستی زاراوەکان

| زاراوە | وشە |
|---|---|
| Aspect | ئەسپێکت |
| Allomorphs | ئەلۆمۆرف |
| Base | بنج |
| linguistic knowledge | توانستە زمانییەکانمان |
| Tense | تێنس |
| Form Classes | پۆلە فۆرمەکان |
| Classification | پۆڵینکردن |
| Paradaigm | پارادایمی |
| Suffix | پاشگر |
| Prefix | پێشگر |
| Phonological Structure | پێکهاتەی فۆنۆلۆجی |
| Substitution | جێگرتنەوە |
| Distribution | دابەشکردن |
| Create of words | دروستکردنی وشە |
| Root | رەگ |
| Term | زاراوە |
| Inflecting language | زمانە ئەرکییەکان |
| Incorporating language | زمانە تێکچڕژاوەکان |
| Analytic language | زمانە دابڕاوەکان |

| | |
|---|---|
| Infixing language | زمانە ناوگرییەکان |
| Agglutinative language | زمانە نووساوەکان |
| Proclitics | زیادەکانی سەرەتای وشە |
| Enclitics | زیادەکانی کۆتایی وشە |
| Head | سەرە |
| Affix | گیرەك |
| Derivation | گیرەکی دارشتن |
| Inflection | گیرەکی رێزمانی |
| Vowel Harmony | ڤاول هارمۆنی |
| Formant | فۆرمات |
| Polysemy | فرەواتا |
| Stem | قەد |
| Blocking | کۆتکردن |
| Confix | کۆنفێکس |
| Morphemic Segments | کەرتی مۆرفیمی |
| Modality | مۆدالێتی |
| Morph | مۆرف |
| Morpho-Semantic fields | مۆرفۆسیمانتیکی بوار |
| Morpho syntax's | مۆرفۆسینتاکس |
| Morphophonemic | مۆرفۆفۆنیم |
| Morpheme | مۆرفیم |
| Free Morpheme | مۆرفیمی ئازاد |

| | |
|---|---|
| Function morpheme | مۆرفیمی ئەرکی |
| Zero Morpheme ø | مۆرفیمی بەتاڵ |
| Empty morpheme | مۆرفیمی بەتاڵ |
| Bound Morpheme | مۆرفیمی بەند |
| Portmanteau | مۆرفیمی پۆرتمانتیو |
| Pronominal Morpheme | مۆرفیمی ڕاناو |
| Root Morphemes | مۆرفیمی ڕەگ |
| Monomes | مۆنیم |
| Identification | ناساندن و دیاریکردن |
| Celtics | نووسەك |
| Homophone | هاوبێژەکان |
| Stress | هێز |
| Linear | هێڵی |
| Lexical Morphology | وشەسازی فەرهەنگی |
| Phonological word | وشەی دەنگی |
| Grammatical word | وشەی ڕێزمانی |
| Lexical Word | وشەی لێکسیکی |
| Potention words | وشەی نەبوو |
| Neologism | وشەی نوێ باو |
| Post Lexical ruler | یاسا دوا لێکسێییەکان |
| Non Sequential Morpheme | یەکە نا لە دوایەکەکان |
| Sequential Morpheme | یەکە یەك لەدوایەکەکان |

# ناوەرۆک

## پێشەکی :

وشەسازی لقێکی زمانەوانی تیۆرییە و تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە فۆرمی وشە و پێکهاتەکانی، لە وشەسازی فەرهەنگی ئەم سنوورە دەبەزێنرێت و وشە بە دانەی سەرەکی شیکردنەوەی وشەسازی دادەنرێت و لە چوارچێوەی گرێ و رستە باس لە گۆڕانکارییە فۆنۆلۆلۆجی و مۆرفۆلۆجیەکان دەکرێت کە بەسەر وشەدا دێت، ئەگەر چی تاڕادەیەك لێکۆڵینەوە لەم بوارە کراوە، بەڵام بە پێی سروشتی زمانی کوردی پێویستی بە لێکۆڵینەوەی بابەتیانەی زیاترە.

زانستی وشەسازی لەو زانستانەیە کە تیۆرەکانی ناتوندرێت بە تەوای پیادەبکرێت لە هیچ زمانێك و زمانی کوردی وەك هەموو زمانەکانی تر، ئەگەر بێت سەیری پەرتووك و لێکۆڵینەوە مۆرفۆلۆجییەکان بکەین بە زەقی هەست بە کێشەکان و جیاوازی بۆچوونی نووسەرەکان دەکەین، بەرادەیەك ئەم جیاوازی بۆچوونە بۆتە کێشە بۆ فێرخوازانی زانکۆ، کە خۆیان لە نێوان دووریانێك دەبینەوە زۆر جار ناچاردەبن چ بە راست یا بە چەوت خۆیان بەلایەکدا بگرن بە پێی بەرژەوەندی خودی نەك زانستی، ئەم پەرتووکە هەوڵێکە بۆ خستنەرووی زانستی وشەسازی بە شێوەیەکی بابەتیانە و لۆجیکیانە نەك بۆچوونی تاکەکەسی، هیوادرم توانیبم بەم هەنگاوە سوودێك بە خوێنەران بگەیەنم، رێزیشم هەیە بۆ هەموو بۆچوونەکان، داوای لێبووردنیش دەکەم لەم بەرێزانەی کە نەم توانیووە نووسینەکانیان وەك سەرچاوە سوودی لێببینم .

دانەر

پ.ی.د.عەبدولواحید موشیر دزەیی
Dr.abdulwahiddezaye@yahoo.com

# بەشی یەکەم : وشەسازی و زانستە زمانییەکان

## ١- وشەسازی و ڕێبازەکانی :

وشەسازی لقێکی ڕێزمانە و یەکێکە لە لێکۆڵینەوە زمانەوانییە وەسفییەکان و لەگەڵ پەیدابوونی قوتابخانەی ڕۆنانکاری سەریهەڵدا، وشەسازی بەشێك لە توانستە زمانییەکانمان Linguistic Knowledge پێکدێنێت لەپاڵ زانستەکانی تر و لقێکە لە ڕێزمان و ئەو زانستەیە لە پێکهاتنی ناوەوەی وشە و پۆلینکردنی مۆرفیمەکان و دەستنیشانکردنی پێکهاتە و ئەرکی دەکۆڵێتەوە، لەگەڵ ئەو یاسایانەی کە وشەی پێ دروست دەکرێت، دواتریش ڕێزکردن و ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەهۆی ڕێزکردنەوە دێتە ئاراوە، لەم زانستەدا جەخت لەسەر ڕواڵەتی مۆرف و وشە دەکرێت .

بۆ لێکۆڵینەوە وشەسازییەکان تاکو ئێستا چوار ڕێباز لە ئارادایە :

أ- شیکردنەوەی وشەسازی پشت بەستوو بە برگەی وشە Syllable-based Morphology (SBM)

ب- شیکردنەوەی وشەسازی پشت بەستوو بە ڕەگ و پێوانە Root-Pattern Morphology (R.B.M)

ج- شیکردنەوەی وشەسازی پشت بەستوو بە قەد Lexeme-based Morphology (LBM)

د- بەکارهێنانی قەد و دەستوورە وشەسازی و ڕستەسازییەکان و تایبەتمەندی وشە (١) .

وشەسازی بە پێی کات دوو جۆرە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت :

أ- ئێستایی : کە باس لە باری ئێستای وشەکە دەکات لە ڕووی ئەرك و پێکهاتەوە

ب– مێـژوویی : دەگەڕێتــەوە بـۆ مێـژووی لـە دایکبـوون و گـۆڕان و بـەکارهێنانی وشەکە.

## ٢- ئەرکی وشەسازی Morphology :

وشەسازی چەند ئەرکێکی هەیە :

أ– دەستنیشانکردنی کەرستە خاوەکان، واتە پێکهاتەکانی وشەسازی .

ب– چۆنییەتی ڕێزبونی مۆرفیمەکان لە سنووری رستە و گرێ .

ج– دەستنیشانکردنی مۆرفەکان، واتە بەستنەوەی فۆنۆلۆجی بە وشەسازی .

## ٣- دیاریکردنی زمانی کوردی بە پێی مۆرفیم :

زمانی کوردی نەبەتەواوی نووساوە و نە بە تەواوی تێکچرژاوە، بـەڵکو لـە نێـوان نووساو و تێکچرژاو دایە، هەروەك لەم روونکردنەوانەی دابەشـکردنی زمانـەکان بـە دیاردەکەوێت (٢) :

١– زمانە دابڕاوەکان Analytic language:

ئەم جۆرە زمانانە ژمارەی وشە و مۆرفیم بەرامبەرە، واتە هەر وشەیەك لـە یـەك مۆرفیم پێکدێت، مۆرفیمەکانیان وشەی سـەربەخۆ و دابـڕاون، گیرەکـی ڕێزمانیـان یان نییە یان کەمە، زمانی ژاپۆنی و چینی و ڤێتنامی باشترین نموونەی ئەم جۆرە زمانانەن. هەندێ لەم زمانانە دابڕاوی تەواو نـین، وەك زمـانی ئینگلیـزی کـە تـەنها (٧) حەوت گیرەکی ڕێزمانی هەیە .

The man is speak<u>ing</u> inglish .

(ing) گیرەکی ڕێزمانییە .

٢- زمانە نووساوەکان Agglutinative language :

بە پێی ڕۆنـان و تایبـەتی وشـە مۆررفیمـەکانی دیاریـدەکرێت، خـاوەنی وشـەی چەند مۆڕفیمێن و ژمارەی مۆڕف یەکسانە بـە ژمـارەی مـۆڕفیم ، کـە مۆڕفیمـەکان دەخرێنە سەریەك تا رادەیەك کاریگەری فۆنەتیکی لە رەگ ناکات ، وەك :

ڕۆیشت : ( رۆ + یش+ ت+ ٠ )

: ( رەگ+ Ø + کاتی رابردوو+ کەس ) .

زمانی کوردی نووساوێکی تەواو نییە، تورکی باشترین نموونەی ئەم جـۆرەن وەك :

Ellerimde : ( El + ler + im + de )

: ( لە + م + کۆ + دەست) : لە دەستەکانم

٣- زمانە تێکچڕژاوەکان Incorporating lamguage :

وشەکانی درێژ و نـاسادەن و لە شێوەی رسـتەدان کـە بـریتێن لـە فرمـان و رەگـی فرمان، زمانی کوردی نموونەی لەم جۆرانەی هەیە وەك :

هات : هەم وشەیە و هەم رستەیە : ( ها + ت + 0 )

: ( رەگ + کات + کەس )

دەتانبینمەوە : ( دە + تان + بین + م + ەوە ) .

: بەردەوامی+ بەرکار +رەگ + بکەر + دووبارەبوونەوە )

٤- زمانە ئەرکییەکان Inflecting language:

ئەو زمانانەن کە ناوگریان زۆرە و کە لە زمانی کوریدا نییە، وشەکانی ئـەم زمانـە نـاسـادەو درێـژن و ئەرکـە رێزمانـەکانیان بـە هـۆی نـاوگرەوە دەبێـت کـە رەگ دەسمێت، عەرەبی و عیبری باشترین نموونەی ئەم جۆرە زمانەن :

دخل : (Dxala)




٥- زمانە ناوگرییەکان Infixing language :

لەم جۆرەی زمان پەنا دەبرێتە بە ئەدگارەکانی وشە، وشە پەیوەندییە وشەسازییەکان جێ بەجێ دەکات و وشەکان زیاتر لە مۆرفیمێکن، لاتینی و گریکی نموونەی ئەم جۆرە زمانەن .

## ٤- وشەسازی و زانستەکانی تر :

زانستی زمان زانستێکی تێکچڕژاوە، بەمەش وشەسازی تێکچڕژانی لەگەڵ زانستەکانی تری ناوەی زمان و دەرەوەی زمان دەبێت، زمان پێکدێت لە روخسار و ناوەرۆك :




لایەنی روخسار ( فۆنۆلۆجی و وشەسازی و رستەسازی دەگرێتەوە، لایەنی ناوەرۆکیش زانستەکانی وەك سیمانتیك و پراگماتیك و لێکسیکۆلۆجی دەگرێتەوە، بەمەش وشەسازی دەکەوێتە هەردوو بازنە، لە رێگای زانستی لێکسیکۆلۆجی و

شێواز. لەم بازنەیەدا پەیوەندی هەریەك لەم زانستانە خراوەتە روو ئێمەش لێرەدا پەیوەندی هەریەك لەم زانستانە بە وشەسازی دەخەینەڕوو :




## أ- وشەسازی و لێكسیكۆلۆجی :

وشە دانەیەكی هاوبەشی وشەسازی و لێكسیكۆلۆجییە، هەردووكیان گرنگی بە وشە دەدەن و لێی دەكۆڵنەوە، بەڵام سنووری لێكۆڵینەوەیان جییایە، وشەسازی Morphology زانستێكە لە شێوەی وشە و پێكهاتی ناوەوەی دەكۆڵێتەوە، بەڵام لێكسیكۆلۆجی لە واتا و گەشەوگۆڕانی دەكۆڵێتەوە، لێرەدا دەتوانین بڵێین وشەسازی گرنگی بە روخسار دەدات، بەڵام لێكسیكۆلۆجی گرنگی بە ناوەرۆك (واتا) دەدات .

## ب- وشەسازی و شێواز :

شێواز بریتییە لە هەڵبژاردنی وشە لە نێو وشەكان، ئەم هەڵبژاردنەش ئاخێوەر یان نووسەر پێی هەڵدەستێت، كە هەڵگری چەند سیمایەكی زمانی دیاریكراوە، شێواز زانستێكە گرنگی بە لایەنی روخسار و ناوەرۆك دەدات، لایەنی وشەسازی جۆرێكە لە روخساری زمان، كەواتە پەیوەندی هەیە لە نێوان وشەسازی و شێواز، ئەگەر شێواز وەك هەڵبژاردن و لادان و دارشتن سەیر بكەین هەر وەك زووربەی شێوازگەرە نوێییەكان وای بۆ دەچن، ئەوا هەموو هەڵبژاردنەكانی زمان شێوازن و

هەریەکەیان ئەرکێك یان زیاتری هەیە، بەم پێیە دەتوانین پێناسەی شێواز بەشێوەیەکی فراوان بکەین و بڵێین : شێواز کۆمەڵێك ئەرکی شێوازی زمانی هەڵبژێردراوە لە کۆگای ڕێزمانی و فەرهەنگی و دەنگی و شێوەیی زمان بە گشتی.

لە شێوازدا وشەکان بە شێوەیەك دادەڕێژرێن کە گونجاوبێت بۆ دەربڕین وەك :

- کوێر : نابینا
- سەقەت : کەم ئەندام ( خاوەن پێداویستی تایبەت ) .
- درۆ : ناڕاست

........هتد .

### ج- وشەسازی و فۆنۆلۆجی:

پەیوەندی وشەسازی بە فۆنۆلۆجییەوە زۆر بەتینە، چونکە مۆرفیم بەهۆی چەند فۆنیمێکەوە دەنوێنرێت، بە پێچەوانەوەش فۆنیمێك یان چەند فۆنیمێك مۆرفیم دەنوێنن، جگە لەمەش دیاریدەی مۆرفۆفۆنیم Morphophoneme پەیوەندییەکی هاوبەشە لە نێوان وشەسازی و فۆنۆلۆجی، چونکە زۆر مۆرفیمان هەیە کە لە شێوەی یەك فۆنیمن، ئەم فۆنیمانە لە ئاستی وشەسازی دا مۆرفیم دەنوێنن و پێی دەگوترێت مۆرفۆفۆنیم (٣) ، وەك زووربەی مۆرفیمەکانی کات و راناوە لکاوەکان بۆ نموونە :

- من هات م
- تۆ هات ی

.......هتد.( م ، ی ) هەم فۆنیمن لە ئاستی دەنگسازی و هەم مۆرفیمە لە ئاستی وشەسازی، ئەمەش پەیوەندییەکی تری فۆنۆلۆجییە بە وشەسازی، سەرەڕای ئەمانەش لەگەڵ لێکدانی مۆرفیمەکان لە سنووری وشەی لێکدراو و دارێژراو و گرێ زۆر لە گۆڕانە فۆنۆلۆجییەکان ڕوودەدەن وەك : توانەوە و دەرکەوتنی دەنگ و

گۆڕانی دەنگ ....هتد .

## د- وشەسازی و ڕستەسازی :

مۆرفیم دەورێکی سینتاکسی هەیە، کە لە ڕۆنانی ڕێزمانی گەورەتر وەك : وشە و گرێ و ڕستەدا دووبارە دەبێتەوە و بەشداری پێکهاتنیان دەکات بۆ دوو ئەرك :

١- ئەرکی گشتی :

ئەرکی ئەرێ و نەرێ و جەختکردن و مەرج.....هتد. دەگرێتەوە.

٢- ئەرکی تایبەتی :

ئەرکی بکەری و بەرکاری ....هتد. دەگرێتەوە (٤) .ئەم پەیوەندییەی وشەسازی بە سینتاکس دیاردەی مۆرفۆسینتاکسی Morpho syntaxs هێنا ئاراوە، کە ئاماژە بۆ ڕۆڵی سینتاکسی هەندێ مۆرفیم دەکات (5) وەك : پیاو+ەکە = پیاوەکە، (ەکە) مۆرفۆسینتاکسە و ئەرکی ناساندن دەبینێت .

وشە وەك پردێك وایە دەنگسازی و ڕستەسازی بەیەکەوە گرێدەدات، ڕستە لە وشە پێکدێت و زۆر لە پێناسەکانی ڕستە ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییە دەکەن وەك :

- ڕستە ئەو ئاخاوتنەیە کە لە دوو وشە یان پتر پەیدا دەبێ مەبەستێك بەدەستەوە دەدات .

- کۆمەڵە ووشەیەکە کە بە شێوەیەکی تایبەت ڕێز دەکرێت و هەموو پێکەوە واتایەکی تەواو دەبەخشن (٦) .

وشە پێکهاتی ناوەوەی ڕستەیە، ئەگەر هەر ڕستەیەك شیبکەینەوە بۆ پێکهێنەرەکانی ئەوا دەبینین وشە پێکهێنەرییەتی وەك :

ئازاد + نان + دەخوات

بکەر + بەرکار + کار

وشەکان لە رستەدا بە پێی سیستەمێك ریز دەبن و گۆران لەم ریزکردنە گۆران لە واتا و ئەرکی رێزمانی دەکات و شوێنی هەر وشەیەکیش دیاریکراوە لە رستە بۆ نموونە (ناو) دەشێ (بکەر) یا (بەرکار) یا (تەواوکەر) ....هتد. بێت و (ئاوەڵناو) دوای (ناو) دێت ......هتد.

زۆر دیاردەهەن لەبەر هۆکاری رێزمانی گۆران لە مۆرفیمەکان روو دەدات وەك گۆرینی رەگ لە ئەنجامی گۆرینی کات لە رابردوو و رانەبردوو :

**ناردن**

**نێر : رانەبردوو** — **نارد : رابردوو**

**وەك : نامەکە دەنێرم** — **وەك : نامەکەم نارد**

هەندێکجار گۆران لە دەنگ روودەدات :

**خواستن**

**خواز : رانەبردوو** — **خواس : رابردوو**

**وەك : دەخوازم** — **وەك : خواستم**

## ٥- وشەسازی و واتاسازی :

یەکێ لە لایەنکانی وشە واتایە بەو پێیەی وشە فۆرمێکی زمانە و واتا ناوەرۆکییەتی و بە هەردووکیان هێما دروست دەکەن، بە واتایەکی تر وشە بێ واتا نابێتە هێما، مۆرفیم بەوە پێناسە دەکرێت، کە بچووکترین دانەی واتاداری زمانە و هەر گۆرانێك لە پێکهاتەی وشەکان بکرێت ئەوا کاریگەری بەسەر واتاوە

هەیە، بۆ نموونە واتای وشەی (گوڵ) جیایە لەگەڵ (گوڵان) و جیایە لەگەڵ (گوڵدان) ئەمەش لەمەوە هاتووە کە فۆرمەکان زیادبوونە جا هەر گۆڕانکارییەك فۆرم روویدات گۆڕان بەسەر واتاکەی دێنێت وەك :

– گوڵ + ەك + ان = گوڵەکان .

لێرەدا واتای گوڵ گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە بۆتە گوڵێکی ناسراوی کۆ.

وشەکان لەناو رستە بە پێی واتا یەکتر هەڵدەبژێرن بۆ نموونە کاری (بینین) لەگەڵ ( ناوی بەرجەستە) بەکاردێت، بەلام لەگەڵ ( ناوی واتایی) بەکار نایەت وەك :

– دارەکەم بینی .

– تاریکیم بینی ?

پەیوەندییەکی تری وشەسازی بە واتاسازی بواری واتاییە، وشە یەکەیەکی پتەوە و بۆ هەڵوەشاندنەوە و ترازاندن نابێت و باوەی وایە واتای وشە لە رێگای ئەو پەیوەندیانەوە دێت، کە وشەکە لەگەڵ وشەکانی تری زمان هەیەتی کە پێی دەوترێت Morpho-Semantic fields وشەکان لە کاتی لێکدانیان لە سنووری رستە بەشێك لە واتاکەی خۆی ون دەکات و بەشێك لە واتا لە دەورووبەرە زمانییەکە، واتە واتا لە وشەکانی پێشتر و پاشتر وەردەگرێت وەك :

– پارەیەکی باش ( باش ) بە واتای زۆر دێت .

– قوتابییەکی باش ( باش ) بە واتای زیرەك دێت .

سەرەڕای ئەمانەش هەر مۆرفیمێك بخرێتەسەر وشەیەك یان مۆرفیمێکی سەربەخۆ یان لێی بکەینەوە ئەوا گۆڕان لە واتا روودەدات وەك :

نا + پاك = ناپاك

نا + راست = ناڕاست ( درۆ) . ئەگەر (نا) لە ناراست بکرێتەوە دەبێتە پێچەوانەی ( درۆ ) .

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین، زمان (فۆرم ) و (واتا) بەیەکەوە گرێدەدات و وشەسازی (دەنگ) و (رستە) لە پەیوەندییەکی هەرەمی دا :




## ٥- مۆرفیم و وشە :

### أ- پێناسەی وشە Word :

وشە جگە لە تایبەتمەندی پێکهاتەیی تایبەتمەندی دەنگی و رێزمانی و شێوازی و هونەری و گەیاندنیشی هەیە، وشە لای وەسفییەکان بە مۆرفیم بەستراوەتەوە پێی وایە مۆرفیمێکە یان زیاتر، لای رۆنانکارەکان بریتییە لە یەکەیەکی

رستەسازی و هەردوو لاکەی وشە بە وەستان گیراوە، جگە لەمانە زمانەوانەکان پێناسەی جۆراو جۆریان بۆ وشەکردووە وەك :

– بلۆمفیڵد Bloom Field : وشە بچووکترین پێکهاتەی واتادارە (٧) .

– ماثیسیوس Mathesius : بچووکترین یەکەی دەنگی بەدوایەکداهاتووە و پەیوەندی بە یەکەی ترەوە نییە .

– ترنکا Trnka : یەکەیەکە دەتوانین لە ڕێگای فۆنیمەوە درکی پێبکەین و ئەرکێکی واتایی Semantic هەیە (٨) .

– ستیڤن ئۆلمان : بچووکترین دانەی سەربەخۆی واتادارە (٩) .

– وشە پێکهاتەی بچووکی ڕێزمانە (١٠) .

– وشە بچووکترین دانەیە لە شیکردنەوەی ڕێزمان (١١) .

– وشە یەکەیەکی بچووکی ڕێزمانە (١٢) .

– وشە بچووکترین دانەی زمانە کە هەڵگری واتابێت (١٣) .

– وشە بچووکترین زنجیرەی دەنگی واتادارە (١٤) .

وشە چەند پێوەرێکی هەیە کە بریتین لە :

١– پێوەری واتایی :

وشە واتادارە و لەسەر ئەم بنچینەیەش فەرهەنگ دروستبووە .

٢– پێوەری شێوە :

وشە پێکهاتەیەکی دەنگی هەیە و لە کۆمەڵێك فۆنیم پێکهاتووە پارێزگری لە شێوە و جێگیری خۆی دەکات و کە دەچێتە رستەش کاریگەری دەکاتە سەر وشەکانی تر و کاریگەریشی دەکەوێتە سەر .

٣– پێوانەی سیانە کە وشە پێکهاتووە لە دەنگ و واتا و ئەرك (١٥) .

٤– پێوەری ڕێنووسی Orthographic Criterion :

وشە بە پێی ئەم پێوەرە زنجیرە پیتێکی دیاریکراوە، لە نووسیندا، ئەم پێوەرە

یارمەتیدەرە بۆ دیاریکردنی وشە، چونکە زۆر جار قوتدانی دەنگ دێتە ئاراوە(١٦).
٥- پێوەری وەستانی ئەگەری Criterion of potential pause :
وشە هەردوو لای بە وەستان دیاریدەکرێت دەشتوانرێت وەستان بکەین (١٧) . لە نێوان ئەم زنجیرە دەنگانە بە تایبەتی لێکدراوەکان، وەك :سەرسپی،مەلاژن .
٦- پێوەری سەربەخۆیی :
سەربەخۆی وشە دەکاتە پێوەر واتە پەیوەندی بە یەکەکانی ترەوە نییە، هەر وەك بلۆمفێلد دەڵێت : بچووکترین پێکاتەی ئازدە (١٨)، بەمەش راناوەکان یان مۆرفیمە یەك پیتییەکان بە وشە دانادرێت، چونکە لکاون .
٧- پێوانەی فۆنۆلۆجی :
لە هەندێ زماندا بە پێوانەی فۆنۆلۆجی وشە دەستنیشان دەکرێت، بۆ نموونە زمان هەیە هێز دەکەوێتە سەر دوا برگەی وشەوە، وەك : ( نووسـتن ) ئەگەر هێز لەسەر دوا برگە بێت (چاوگە) و وشەیە و ئەگەر لە سەرەتا بێت رستەیە، بەڵام ناوێزە زۆرە لە زمانی کوردیدا، بۆ نموونە لە وشەکانی : بەڵام، چونکە،...هتد. هێز لە سەرەتایە. زمانی تورکی و هەنگاری سەر بەسیتەمی (Vowel Harmony) لەم جۆرە زمانانەدا ڤاوڵی رەگ چ جۆر بێت پێشگر و پاشگریش سەر بۆ هەمان جۆر دائەنوێنن، واتە گۆرینی شێوەی ڤاوڵ گوێزانەوەیە لە وشەیەك بۆ وشەیەکی تر، ئەمەش ناوێزەی زۆری تێدەکەوێت (١٩). هەموو ئەم پێوەرانە ناتوانن سنووری وشە بە تەواوی دیاریبکەن بۆیە پەنایان بردە بە دانەیەکی وردتر کە مۆرفیمە .
وشە لە رووی بەکارهێنان دەبێتە سێ جۆر :
أ- وشەی دەنگی Phonological word :
ئەو یەکەیەیە کە لە فۆنیم پێکهاتووە بۆ نموونە وشەی ( چاوان ) پێکهاتووە لە فۆنیمەکانی ( چ، ا ، و، ا ، ن )

ب– وشەی ڕێزمانی Grammatical word :

پەیوەستە بە وێنەی دەنگی واتە وشەی فۆنۆلۆجی لە ڕستەدا وەك : ( گەستن ) لە ڕانەبردوو دا دەبێتە : ( دەگەزم ) .

٣– وشەی لێکسیکی Lexical Word :

وشەیەکی ئەبستراکە و شێوەی جیاجیا وەردەگەرێت بە گوێرەی گەردانکردنی وەك، نووست شێوەی تر وەردەگرێت ( نووستم، دەنووست، بنوو ...هتد ) (٢٠)

## ب- جیاوازی نێوان وشە و مۆرفیم :

مۆرفیم بۆی هەیە وشەیەك بێت و وشەش بۆی هەیە مۆرفیمێك یان زیاتر بێت، ئاشکرایە کە مۆرفیم بچووکترین پارچەی وشەی واتا دارە، لێرەدا دەتوانین بڵێین هەموو وشەیەکی سادە مۆرفیمە، بەڵام هەموو مۆرفیمێك وشە نییە، چونکە مۆرفیمە بەندەکان ناچنە خانەی وشە بەم پێیە پەیوەندی هەیە لە نێوان وشە و مۆرفیم، بەهەمان شێوە جیاوازیش هەیە :

( دار ) وشەیە و مۆرفیمێکی سەربەخۆیە .

( دار سێو ) : وشەیە و لە دوو مۆرفیم پێکهاتووە .

بازنە : وشەیە و لە دوو مۆرفیم پێکهاتووە ( بازن + ە)

دەتوانین جیاوازی نێوان وشە و مۆرفیم لەم خاڵانە چڕبکەینەوە :

١– مۆفیم کەرت ناکرێت، بەڵام وشە کەرت دەکرێت .

٢– هەموو مۆرفیمێك وشە نییە، تەنها مۆرفیمە سەربەخۆکان وشەن .

٣– هەموو وشەیەك بەرامبەر یەك مۆرفیم نییە، وشە هەیە لە چەند مۆرفیمێك پێکهاتووە (٢١) .

## ج- بەشەکانی وشە :

### ١- رەگ Root :

بچووکترین پارچەی وشەیە کاتێك کە وشەی ناسادە شیدەکەینەوە وەك : سەرلێدان ، ( سەر ، دان ) رەگی وشەی Khoja's Stemmer شیرین خۆجە پێی وایە رەگی وشە بەوە دەردەهێنێت، کە پێشگر و پاشگرەکانی لێدەکاتەوە.کە چەند جۆرێکن وەك :

أ- زیادەکانی سەرەتای وشە Proclitics، کە وشە دادەرێن وەك : نا، بە، ...هتد.

ب- پێشگرەکان Prefixes وەك بە+ هێز

ج- پاشگرەکان Suffixes وەك : ئاسن + گەر

د- زیادەکانی کۆتایی وشە Enclitics ب + نووس + ت + ایە

رەگ دوو جۆرە :

١- رەگی ئازاد : کوڕ

أ- وشەی فەرهەنگی : ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار.....هتد

ب- وشەی ئەرکی : ئەم.. ە ....هتد .

٢- رەگی بەند : وەك ترخێنە ( ترخ ) .

### ٢- قەد Stem :

گیرەکە رێزمانییەکان لە وشەکە دەکرێتەوە دەبێتە قەد، کە لەوانەیە سادە یان لێکدراو بێت، وەك : نانەکە (نان) قەدی سادەیە،( شاسوار) : شا + سوار ، قەدی ناسادەیە. قەد بە پێی گەردان لە گۆڕاندایە بۆ نموونە : قەدی ( دەخۆم ) وەك قەدی ( دەخوارد ) نییە .

### ٣- بنج Base :

کاتێك مۆرفیمه رێزمانییه‌کان یان دارشتنه‌کان له وشه ده‌کرێته‌وه، ئه‌وا ده‌بێته قه‌د، وه‌ك : نه‌مر ، ( مر ) ره‌گ و بنجه .

## د- جۆره‌کانی وشه :

وشه له چه‌ند روویه‌که‌وه دابه‌شکراوه، هه‌ندێکیان به پێی ئه‌رکه و هه‌ندێکی تر به پێی بواری زمانه‌وانییه ئه‌مه‌ش نموونه‌ی هه‌ندێك له‌م دابه‌شکردنانه‌یه :

### أ- له رووی پێکهاته‌وه :

وشه له رووی پێکهاته‌وه دابه‌ش ده‌بێت بۆ :

#### ١- ساده:

ئه‌و وشه‌یه که له مۆرفیمێکی سه‌ربه‌خۆ پێکهاتووه وه‌ك : گوڵ ، دار ، چیا....هتد .

#### ٢- لێکدراو:

له دوو مۆرفیمی سه‌ربه‌خۆ پێکهاتووه، هه‌ندێکجار به بێ مۆرفیم به‌یه‌که‌وه ده‌به‌سترێن پێی ده‌گوترێت وشه‌ی لێکدراوی سینتاکسی وه‌ك: دار سێو ، ماستاو ، سه‌ربان، سه‌رسپی...هتد. هه‌ندێکی تر به مۆرفیمی لێکده‌ر به یه‌که‌وه ده‌به‌سترێن و پێی ده‌گوترێت وشه‌ی لێکدراوی ناسینتاکسی وه‌ك : کولێره‌به‌رۆن ، ته‌ره‌پیاز ، به‌رده‌نوێژ، گێله پیاو، ره‌شه‌با....هتد .

#### ٣- دارژاو:

ئه‌و وشانه ده‌گرێته‌وه که به یارمه‌تی پێشگر و پاشگر دروست ده‌کرێن وه‌ك :

ناپیاو ، نەخۆش ، نەزان ، ئیشکەر ، نانەوا ، ئاسنگەر.....هتد.

٤- دەستە :

کۆمەڵێ وشە دەگرێتەوە کە کاریان تێدا نییە وەك: لەسەر دیوارەکە، بۆ کرێ، دوو پیاو....هتد، (٢٢) کە لە رێزمانی نوێدا دەچێتە خانەی گرێ .

ب- لە رووی لۆجیکەوە :

وشە بە پێی لۆجیك دابەش دەبێت بۆ :

أ- تایبەت :

ئەو وشانە دەگرێتەوە کە یەك واتای هەیە وەك دار ، بەرد ، ئاسن...هتد.

ب- هاوبەش :

وشە فرەواتا Polysemy و هاوبێژەکان Homophone دەگرێتەوە، کە زیاتر لە واتایەکیان هەیە وەك : شیر ، رۆژ ، بیر ، ......هتد.

ج- گواستراوە :

ئەو وشانە دەگرێتەوە کە لە سەرەتا واتایەکیان هەبووە، دواتر لەبەر بوونی پەیوەندی گواستراوەتەوە بۆ واتایەکی تر . وەك : وەرقە ( لە کاغەزەوە ) بۆ ( $١٠٠ ) .

د- لەخۆوە :

وشە تاریکەکان دەگرێتەوە کە لەسەرەتا واتایەکی هەبووە دواتر بۆ واتایەکی تر بەکارهاتووە کە هیچ پەیوەندی پێوە نییە وەك : ( شۆخ ) سەرەتا بەواتای ( بێ حەیا ) هاتووە و ئێستا بە واتای (جوان) دێت .

هـ- دروست :

ئەو وشانە دەگرێتەوە کە بۆ واتا بنچینەییەکە بەکارهێنراوە. وەك : گوڵ بۆ تەنی گوڵ .

و- خوازە :

ئەو وشانە دەگرێتەوە کە بە واتا بنچینەییەکی بەکار نەکارهاتووە ئەمەش لە ئەنجامی بوونی پەیوەندی لە نێوانییان. وەك ناونانی ( شێر ) بۆ مرۆڤێکی (ئازا).

### ج- لە رووی ئەرکەوە :

وشەکان بەپێی ئەرك و شوێنیان لە رستە پۆلیان دیاریدەکرێت (٢٣). نەك واتا، چونکە وشەکان زۆر جار لە زماندا چۆلی خۆیان دەگۆڕن، بۆ نموونە وشەی جوان ئاوەڵناوە، بەڵام لە رستەی :

- منداڵەکە جوان دەڕوات . جوان ئاوەڵکارە نەك ئاوەڵناو .

لە رستەی :

- جوان بۆتە دایك . جوان ناوە نەك ئاوەڵناو .....هتد .

### د- لە رووی وشەسازییەوە :

وشە لەم روانگەیەوە بە پێی مۆرفیم و گەردانکردن دیاریدەکرێت وەك ئەوەی هەر وشەیەك (ان، ەکە، ێك ) وەربگرێت ناوە، ئەوەی (تر، ترین) وەربگرێت، ئاوەڵناوە .....هتد.

### هـ- لە رووی واتاوە :

وشەکان لەم روانگەیەوە بە پێی واتا دیاریدەکرێن وەك : جوان : ئاوەڵناو، سروە ، ناوە، لەسەر : ئاوەڵکارە ........هتد .

## و- لە رووی تایبەت و گشتییەوە :

١- وشەی گشتی :

وشەکانی قسەی رۆژانە دەگرێتەوە و تایبەت نییە بە بوارێك یان زارێکی پیشەیی وەك : خانوو ، ئۆتۆمۆبێل ، پەرتووك ، ....هتد .

٢- وشەی تایبەت ( زاراوە ) :

ئەو وشانەن کە لە فەرهەنگێکی تایبەت دەدۆزرێتەوە (٢٤)، بۆ نموونە: شیردەر، کەهرۆموگناتیس، هێشوە بزوێن....هتد. لە فەرهەنگی تایبەت دۆزرێتەوە هەر بۆیەش دەچنە خانەی زاراوە (Term).

## ز- لە رووی سستی و چالاکییەوە :

١- وشەی سست :

ئەو وشانەن کە لە فەرهەنگی زماندا هەن، بەلاّم بەکارهێنانیان کەمە وەك : یاریکەر، دۆست، ناندین،....هتد .

٢- وشەی چالاك :

ئەو وشانەن کە بەکارهێنان و دووبارەبوونەوەیان زۆرە لە زمانی ئاخاوتن و نووسین (٢٥)، وەك : دەست ، نان ، خوارد ، ....هتد .

دوو جۆرە چالاکی لە وشەسازی دەبینرێت :

أ- چالاکی بە پێی یاسای زمان :

وەك هەموو وشەکانی زمان بە دارێژراو و لێکدراوەوە .

ب- چالاکی لە رێگای بەزاندنی یاسا زمانییەکان :

ئەم جۆرە دەچێتە خانەی داهێنان، کە بەبێ یاسا دروست نابێت و واتاکەی پێشبینی ناکرێت وەك : کونەبا ، پایزەبرا ، دەسگیران ،....هتد.

دروستکردنی وشه له زماندا و به تایبه‌تی له زمانی کوردی کارێکی ئاسان نییه، چونکه زۆر هۆکار هه‌ن که دارِشتن کۆت Bloking ده‌که‌ن و چالاکی که‌مده‌که‌نه‌وه له‌وانه‌ش :

١- کۆتی فۆنۆلۆجی Phonological Bloking:

وه‌ك : ( ب، ەر ) ده‌چنه سه‌ر ره‌گی ساده و نابێت له‌یه‌ك برِگه زیاتربێت وه‌ك : بکوژ ، نووسه‌ر ، ....هتد .

٢- کۆتی وشه‌سازی Morphological Bloking:

پاشگری (نده) ته‌نها له‌گه‌ڵ بنجی بێگانه دێت وه‌ك : درنده، کوشنده، ....هتد .

٣- کۆتی واتایی Semanitical Bloking:

یاسا واتاییه‌کان رێگا له چالاکی هه‌ندێ مۆرفیم ده‌گرن وه‌ك : ( نا ) ته‌نها وشه‌ی نیشان نه‌کراو و پۆزه‌تیڤ ئه‌م مۆرفیمانه وه‌رده‌گرێت : وه‌ك : ناپاك ، ناساغ، ناشیرن ، ...هتد. وشه نێگه‌تیفه‌کان ئه‌م مۆرفیمانه وه‌رناگرن و ناتوانین بڵێین : ناپیس ، چونکه ( پاك) مان هه‌یه .

٤- کۆتی جوانکاری Cosmetical Bloking :

وه‌ك : ئاخاوتن +ەر : ئاخاوتنه‌ر ، جوان نییه بۆیه بۆته ئاخێوه‌ر .

٥- کۆتی کۆمه‌لایه‌تی و ده‌روونی Social & Psychological Bloking :

زمان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی دیارده‌یه‌کی کۆمه‌لایه‌تییه بۆیه زۆرجار کۆمه‌ڵ کۆت بۆ وشه داهێنراوه‌کان داده‌نێت و لێناگه‌رێت بروات وه‌ك پاشگره‌کانی ( گا، دان ، کرد، به‌ر، که‌ر .....هتد. که له زمانی کوردی سستن، چونکه ناتوانن به‌شداری دارشتن بکه‌ن له‌به‌ر نزیکایه‌تییان له وشه تابۆکان، یان نه‌گونجاوه‌کان و که‌م نرخه‌کان .

٦- بوونی وشه‌ی به‌هه‌مان واتا :

بوونی وشه به هه‌مان واتا له‌زمانێکدا وا ده‌کات وشه‌که دروست نه‌بێت وه‌ك : بوونی (نووسه‌ر) وا ده‌کات (بنووس) دروست نه‌بێت یان (نووسیار) دروست

نەبێت، بوونی (فرۆشیار) وایکردووە کە (بفرۆش) دروست نەبێت....هتد.

### ح- لە رووی بڵاوی و نابڵاوییەوە :

وشەکان بڵاویان لەناو زمان پلەدارە (٢٦) :

١- زۆر بڵاو :

ئەو وشانەن کە لە نووسین و قسەکردن بە فراوانی بەکاردێن .

٢- ناوەندە بڵاو :

ئەو وشانەن کە بڵاوییان مام ناوەندە .

٣- دەگمەنە بڵاو :

ئەو وشانەن کە بە دەگمەنی بەکاردێن .

بەڕای من باشترین دابەشکردن ئەوەیە کە بە پێی ئەرك بکرێت، چونکە وشەکان پۆلی خۆیان دەگۆڕن، مەرج نییە وشە لە بەکارهێنان پارێزگاری لە پۆلی خۆی بکات .

## ٦- مۆرف و مۆرفیم و ئەلۆمۆرف :

### أ- مۆرف Morph:

مۆرف وەکو زاراوە یەکەمجار لە لایەن تشارلز هۆکێت بەکارهاتووە دواتریش هاریس Hrrris زاراوەی کەرتی مۆرفیمی ( Morphemic Segments ) بۆ بەکارهێناوە (٢٧)، مۆرف بەشێکی بەرجەستەی دەربڕین و نووسینە، واتە فۆرمێکی فیزیکییە و خاوەن قەبارەیە، بە پێچەوانەی مۆرفیم کە یەکەیەکی هۆشەکی بێ قەبارەیە، مۆرف خۆی فۆنیمێکە یان زنجیرە فۆنیمێکی جیاوازە لە ژینگەی تر دووبارە دەبێتەوە (٢٨) ، زۆر جار چەند شێوەیەکی مۆرف لە یەك مۆرفیمدا کۆبوونەتەوە و پێیان دەگوترێت (ئەلۆمۆرف) بۆ نموونە مۆرفیمی (ەکە) نیشانەی

ناسراوی به چەند شێوەیەکی تر دەردەبڕدرێت به پێی ژینەکەی دەگۆڕێت بۆ ( ك، کە، یەکە، ۆکە، ێکە ) و ناکرێ به مۆرفیمی دیکه دابنرێ، بەڵکو ئەوانە شێوەی مۆرفیمی (ەکە) ن (٢٩) .

## ب- مۆرفیم Morpheme :

مۆرفیم شێوەیەکی ئەبستراکە و بەشێکە لە سیستەمی زمان، لە وشەی یۆنانی (Morphe) وەرگیراوە کە بە واتای شێوە دێت، بەرامبەر وشەی (Form) ئینگلیزی دەوەستێت (٣٠)، کە هێمای [ ] بۆ دادەنرێت وەك: [چاو] و [ان] ، مۆرفیم لە سەرەتای چلەکان دا هاتە کایەوە، بەپێی ئەم بیرە هەموو کەرستەیەکی ڕێزمان شی دەکرێتەوە بۆ چەند دانەیەکی بچووك کە پێی دەوترێ (مۆرفیم) و ئەلۆمۆرفیش وەك زاراوەیەك بۆ ئەو شێوە جیاجیایانەی مۆرفیمێك بەکاردێ کە لە چوارچێوەی تردا ئەرکی مۆرفیم دەبینێ .

مۆرفیم (بچووکترین کەرستەی زمانە، کە واتای هەبی). واتای مۆرفیمێك بەرامبەر واتای هەموو مۆرفیمەکانی تری زمانەکە دەوەستێ. بە واتای ئەوەی لەگەڵ هەموویان جیاوازە، چەند خاڵێك لەم بنەمایەوە هەڵ دەهێنجرێت :

١- ئەگەر مۆفیمێك بۆ گووتنێك زیاد بکرێ یان لاببرێت واتای گووتنەکە دەگۆڕێ بۆ نموونە: شارەزایی ـ شارەزایی یان ـ نەشارەزایی ، لەگەڵ (شارەزا) جیاوازن لە واتادا .

٢- بلۆش Bloch و تراگەر Trager پێیان وایە مۆرفیم کەرت ناکرێت بۆ پارچەی وردتر (٣١) ئەگەر کەرت بکرێ بۆ پارچەی ووردتر ئەوا دەشێوێ و کەرتی بێ واتا دروست دەبێ بۆ نموونە ئەگەر [ڕەسەن] وەربگرین کەرت ناکرێ و بە کەرتکردنی واتاکەی دەشێوێ (ڕە ـ سەن...) (٣٢) . شیکردنەوە و کەرت کردنی مۆرفیم ڕاستەوخۆ دەمانباتە ڕۆنانی (فۆنۆلۆجی زمان) (٣٣) چونکە فۆنیم مۆرفیم

دەنوێنێت .

٣- مۆرفیم یان واتادارە یان ئەرکی رێزمانی هەیە. بۆ نموونە :

- ناسك (نا) برگەیە و مۆرفیم نییە، چونکە ئەرکی نییە .

- ناچین (نا) برگەیە و مۆرفیمە، چونکە ئەرکی نەرێ دەبینێت .

٤- مۆرفیم دەبێت لە ژینگەی جۆراوجۆر دووبارە ببنەوە.

پێناسەی جۆراوجۆر بۆ مۆرفیم کراوە و کەم و کورتیان تێدا دەبیندرێ، بەڵام لە هەموان باشتر ئەوەیە کە دەڵێ :

مۆرفیم بچووکترین دانەی واتاداری زمانە، (٣٤) مۆرفیم خۆی دانەیەکی فیزیکی نابەرجەستەیە وشەیەك یان واتایەکی نوێ دادەتاشێت یان ئەرکێکی رێزمانی دەگەیەنێت، بە واتای ئەوەی شێوەیەکی فۆنەتیکی هەیە یان فۆرمە و بوونێکی ماددی هەیە. بەمە لە فۆنیم (phoneme) و هەموو دانەکانی تری ئاستی فۆنۆلۆجی جیا دەبێتەوە. جیا کردنەوە و ناسینەوە و دیاری کردنی مۆرفیم کارێکی گران نیە و لە زۆر باردا بە بێ گیروگرفت بیرەکە جێ بەجێ دەبێت (٣٥)، بۆ نموونە لە رستەیەکی وەك :

- بەیانی دەچین بۆ سەیران .

بە ئاسانی دەتوانین ٦ مۆفیم لە یەکتر جیا بکەینەوە:

بەیانی - دە - چ - ین - بۆ - سەیران

## ج- مۆرف و مۆرفیم :

ئەو یەکانەی کە پێکهاتەیەکی فۆنۆلۆجییان هەیە Phonological Structure، بە چەند رێگایەك پەیوەندی نێوان مۆرف و مۆرفیم دیاریدەکەن ئەویش لە رێگای :

١- یەك مۆرفیم بەرامبەر یەك مۆرف وەك : دەرگا

٢- یەك مۆرف بەرامبەر چەند مۆرفیمێك وەك : رۆژ یەك مۆرفیە، بەڵام دوو

مۆرفە، چونکە واتای ١( خۆر) واتای ٢ ( ڕۆژەکانی هەفتەیە ) کە هەریەك لەم مۆرفانە پێی دەوترێت مۆرفیمی پۆرتمانتیو (Portmanteau)، کە ئەو مۆرفیمانە دەگرێتەوە کە زیاتر لە تایبەتمەندییەکی مۆرفۆلۆجیان هەیە، وەك : مۆرفیمی (ن) وەك سیٚ مۆرفیم کاردەکات :

أ– وەك نیشانەی چاوگ ( چوون)

ب– وەك ڕاناوی لکاو (ن) ی بەرامبەر (ئەوان)

ج– وەك نیشانەی ڕێککەوتن : ئەوان چوون (٣٦) .

٣– یەك مۆرفیم بەرامبەر چەند مۆرفیمێك وەك مۆرفیمی (ەکە) کە چەند مۆرفێکی هەیە ( ەك ، ك ، یەکە ، ۆکە.....هتد )

ئەگەر ژمارەی مۆرفیم لە ژماری مۆرف زیاتربێت ئەوا مۆرفیمی سفر Zero Morphime دروست دەبێت وەك : ( کەوت ) سیٚ مۆرفیم و دوو مۆرف پێکهاتووە (کەو+ت+ ٠) ( ڕەگ + کات + کەس) مۆرفیمی کەس (ئەو) مۆرفی نییە، بەڵام ئەگەر ژمارەی مۆرفەکان لە ژمارەی مۆرفیمەکان زیاتربوو ئەوا مۆرفیمی بەتاڵ Emputy morpheme دێتە ئاراوە وەك هەموو ناوگرێك وەك :

ڕۆیشت = ( ڕۆ (ڕەگ) + یش ( ناوگر : Ø مۆرفیمی بەتاڵ ) + ت (کات) .

## د- ئەلۆمۆرف Allomorphs :

شێوە جیاجیاکانی مۆرفیمە بە دەربڕینی جیاواز (٣٧)، بۆ نموونە مۆرفیمی (سێیەمی تاك) لەگەڵ فرماندا دەردەکەوێت بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ بکەر لەکاتی داهاتوو بەم شێوانە دەردەکەوێت، [ات]،[ێت]، [ ا]، [یٚ] بە کۆی ئەم مۆرفانە دەگوترێت ئەلۆمۆرف .

– دەشوات : ات

– دەماڵێت : ێت

– دەڕوا : ا دەشێ بە یاسایەکی ئارەزوومەندانە ( Optional ) (ت) لابردرێ

– دەچێ : ێ (٣٨) .

ئەلۆمۆرف بەندە بە چەند هۆکارێك وەك :

١– هۆکاری فۆنۆلۆجی :

ژینگەی فۆنۆلۆجی دەبێتە هۆکار بۆ دروستبوونی وەك (ەکە) :




– یاری +ەکە : یارییەکە

– قاپی + ەکە: قاپێکە

– خانوو+ ەکە : خانۆکە

– مامۆست + اك + ان : مامۆستاکان

ئەم کارتێکردنە دەنگیانە دیاردەی مۆڕفۆفۆنیم (Morphophonemic) دروست دەکات (٣٩) .

٢– هۆکاری ڕێزمانی :

لە ئەنجامی دەوروبەری ڕێزمانی دروست دەبن (٤٠). وەك گۆڕینی ( لە) بۆ ( تێ ، پێ ) ، وەك :

– لێکدانی ( لە +ئەو ) م گرت : دەبێتە تێمگرت .

– لێکدانی ( بە + ئەو ) م گوت : دەبێتە : پێمگرت

یان گۆڕینی (ان) بۆ چەند مۆڕفێکی تر وەك :




- مامۆستایان
- میوەجات
- کوڕ گەل
- ساڵەها
- سەوزە وات

٣- هۆکاری لێکسیکی :

وشەکە خۆی ئەو بارە هەڵدەبژێرێت (٤١)، وەك مۆرفیمی( نوێ ) وەك :




- نوێخواز
- نۆماڵ
- نەورۆز

٤- هۆکاری ئەرکی :

ئەو ئەلۆمۆرفانە دەگرێتەوە کە بە تەواوەتی لەناو چووە و تەنها لە ئەرکدا مـاوە وەك گۆڕانی ( هات ) بۆ ( وەرە )، یان (ان) :




- مێ گەل
- دێ‌هات
- میرەجات
- سەوزەوات

٥- هۆکاری شێوەزاری :

له ئـەنجامی زارەکانـەوە دروسـت دەبـن وەك : (ەوە، وە) لـە زاری ناوەڕاسـت شێوەی تری هەیە لە زاری کرمانجی سەروو (ەڤە، ڤە) (٤٢) و لە زاری هەورامی (ۆ) و لە زاری لوڕی (ەو) کە ئەرکی دووپاتکردنەوە دەبینن (٤٣) وەك :



## ٧- جۆرەکانی مۆرفیم :

تاکو ئێستا چەند پۆلینێك بۆ جۆرەکانی مۆرفیم کراوە لەوانەش :

### أ- مۆرفیمی سەرەکی و لاوەکی :

١- مۆرفیمی سەرەکی :

ئەو مۆرفیمانە دەگرێتەوە کە وێنەیەکی دەنگییان هەیە جا فۆنیمێك بێت یان برگەیەك بێت یان وشەیەك بێت. بەم پێیە هەموو ڕەگەکان مۆرفیمی سەرەکین .

٢- مۆرفیمی لاوەکی :

ئاوازە و هێز و وەستان دەگرێتەوە لەگەڵ جێگۆرکێی دەنگە بزوێنەکان کە وێنەیەکی دەنگی نووسراویان نییە .

٣- مۆرفیمی سفر ٠ :

وێنەیەکی روونی دەنگییان نییە و لادراوە لە رێگای واتای ئەرکییەوە هەستی پێدەکرێت (٤٤) . بۆ نموونە کار هەرچەندە شوێنی تێدایە، بەلاّم بە مۆرفیم نانوێندرێت لە رێگای چەمکەوە هەست دەکەین هەیە بۆیە مۆرفیمی سفری بۆ دادەنێین .وەك : کوشت : پێکهاتووە لە : ڕەگ + کاتی رابردوو + کەس

: کوش + ت + 0

### ب- دابەشکردنی فندریس :

فندریس سێ جۆرە مۆرفیم جیادەکاتەوە (٤٥) :

١- مۆرفیمی دەنگی :

ئەو مۆرفیمانە دەگرێتەوە کە لەسەر بنەمای وێنەی دەنگی دروست بووە، لە شێوەی فۆنیم وەك : ( م ) یان لە شێوەی برگە وەك : برگەی ( دار ) کە مۆرفیمێکە یان لە شێوەی چەند برگەیەك وەك : (باران) کە یەك مۆرفیمە...هتد..

٢- مۆرفیمی شاراوەی دەنگی :

ئەو مۆرفیمە دەنگیانە دەگرێتەوە کە بە واتای خۆیان بەکارهاتوون یان لە ڕێگای ڕێزکردنەوە هاتوونەتە ئاراوە وەك مۆرفیمە سەربەخۆکان و مۆرفیمە بەندەکان کە شێوەیەکی گۆکردنیان هەیە .

٣- مۆرفیمی شاراوەی ڕێزکردن :

ئەو واتایانە دەگرێتەوە کە مۆرفەکان لە شوێنەکان وەریدەگرن لە ڕێگای ڕێزکردن و بەکارهێنان بیّ واتاکەی خۆیان .

- ئاوات رۆژگاری بینی .

- رۆژگار ئاواتی بینی .

## ج- مۆرفیمی سەربەخۆ و بەند :

بڵاوترین دابەشکردنی مۆرفیمە لە بواری وشەسازی، ئەم دابەشکردنەی مۆرفیم لەسەر بنەمای سەبەخۆ بوون و نەبوون دیاریکراوە کە دابەشی دەکات بۆ دوو :

١- مۆرفیمی ئازاد Free Morpheme :

مۆرفیمی (سەربەخۆ، لێکسیکی ئەرکی) Sequential Morpheme پێدەگوترێت، ئەم مۆرفیمانەن کە بە تەنیا واتا دەبەخشن و هیچ وشەیەکیان پێوە نالکێت، ئەم شێوەی مۆرفیم زیاتر لە رەگ Root نزیکە بۆیە دەتوانین بڵێین مۆرفیمی ڕەگ Root Morphemes وەك : هونەر

٢- مۆرفیمی بەند Bound Morpheme :

مۆرفیمی (وشەیی ، ڕێزمانی) ئەم مۆرفیمانە سەر بەخۆ نین و بە وشەی ترەوە دەلکێن و بە تەنیا هیچ واتایەك نابەخشن وەك :

- هونەرمەندەکان بەرێگەوەن بۆ ئێرە :

هونەر ـ مۆرفیمێکی ئازادە

مەند : بەند (وشە داڕێژ)ە.

ەکە : بەند (ڕێزمان)

ئان : بەند

بە : ئازاد

ڕێگە : ئازاد

ەوە : بەند

ن : بەند

بۆ : ئازاد

ئێرە : ئازاد (٤٦)

## د- دابەشکردنی ماریۆ پای :

ماریۆ پای وا بەباش دەزانێت مۆرفیم دابەشکرێت بۆ دوو جۆر :

١- فۆرمات Formant:

مۆرفیمە سەربەخۆکان دەگرێتەوە و بە تەنها واتادارە .

٢- مۆرفیم Morpheme :

مۆرفیمە بەندەکان دەگرێتەوە، کە بەتەنها نایەت و واتای سەربەخۆی نییە و شوێنی جۆراوجۆر وەردەگرن کە دەبێتە :

أ- زیادە Affix :

ئەم شێوەی مۆرفیمە ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە، کە بە ڕەگی وشەوە دەلکێت :

١- پێشگر Prefix :

بە سەرەتای وشەوە دەلکێت وەك : (ب) لە بگۆڕ، ( نە) لە نەخۆش .

٢- ناوگر Infix ڕەگی کار دەسمێت :

هەندێك لە زمانەوانان پێیان وایە هەیە وەك : بزا وتن . و هەندێکی تر دەڵێن لە کوردیدا نییە .

٣- پاشگر Suffix :

بە کۆتایی وشەوە دەلکێت وەك : نووسەر ( ەر) فرۆشیار (یار) .

٤- کۆنفێکس Confix :

جووتەگری پێدەڵێن کە بە سەرەتا و کۆتایی وشە دەلکێت یان سەرەتا و ناوەوەی وشە دەلکێت وەك :

- بهاتایە : (ب) + هات + ( ایە )

ب- مۆرفیمی راناو : Pronominal Morpheme

مۆرفیمە لکاوە کەسسیەکان دەگرێتەوە، کۆتایی وشەوە دەلکێن .

ج- مۆرفیمی سفر . Zero Morpheme:

ئەو مۆرفیمانە دەگرێتەوە کە دەرناکەون، چونکە گۆناکرێن و ناش نووسرێن (٤٧).

وەك : هات، کە مۆرفیمی کەس تیایدا سفرە : [ها] + [ت]+ [0] .

: رەگ + کات + کەس

### ٥- دابەشکردنی مارتنت :

مارتنت وشەی مۆنیم Monemes بۆ مۆرفیم بەکاردێنێت، پێی وایە زنجیرە فۆنیمێکی واتادارە، دابەشکردن و لەتکردنی واتای بزردەکات، مۆنیم لای مارتنت روخسار و ناوەرۆك دەگرێتەوە (٤٨).، بە واتایەکی تر فۆرم و واتا دەگرێتەوە، و دەیکاتە دوو بەش :

١- مۆنیمی لێکسیکی :

بچووکترین بنکەی ووشەیە کە مانای سەرەکی ووشەکە هەڵدەگرن و دەچێتە کۆمەڵەی کراوەی زمان و ئەگەری فراوانبوون و دەوڵەمەندبوونی هەیە وەك : رەگ

و ناو و کار و ئاوەڵناو و ئاوەڵکار و ......هتد. بۆ نموونە لە وشەی (چڵکن) ، ڕەگی (چڵك) ، بچووکترین بنکەیە و مانای سەرەکی وشەکەی هەڵگرتووە .

٢- مۆنیمی ڕێزمانی :

دەچێتەخانەی کۆمەڵەی داخراوەکانی زمان دەگرێتەوە، کە ژمارەی ئەندامەکانی سنووردار و ئەندامەکان واتای یەکتر دیاریدەکەن وەك: پێشگر و پاشگر و گیرەك و نووسەك و ئامرازەکانی نیشانە و مۆرفۆمۆنیمەکان.....هتد، کە ناگۆڕێن و بە لکاندنیان واتا دەگۆڕن (٤٩). دەتوانین بڵێین ئەم مۆرفیمانە ئەرکین Function Morphime و ئەرکی ڕێزمانی دەگەیەنن .

## و- جۆرەکانی مۆرفیم بە پێی بەدواییەکداهاتن :

یەکە وشەسازییەکان بە پێی ڕیزبوون دوو جۆرن :

١- یەکە یەك لەدوایەکەکان Sequential Morpheme:

ئەو مۆرفیمانە دەگرێتەوە، کە بەدوای پێکهاتە دەنگییەکەدا دێن لە نەبزوێن و بزوێن بەبێ جیاکردنەوە وەك ڕاناوی نووساو بە ( کار ) .

٢- یەکە نا لە دوایەکەکان Non Sequential Morpheme:

ئەو مۆرفیمانە دەگرێتەوە کە پێکهاتە دەنگییەکانی لە بزوێن و نەبزوێن نەلکاون بەیەکەوە .

## ٨- ئەرکی مۆرفیم :

واتای وەرگیراو لە پێکهاتەی مۆرفیم دەگرێتەوە، بۆ نموونە ئەرکی وشەسازی ئەو مۆرفیمانەی کە ناو دەنوێنن، ئاماژە بۆ ناو دەکەن و کات بەشێك نییە تیایدا، ئەرکی وشەسازی ئەو مۆرفیمانەی کە (کار) دەنوێنن ئاماژە بۆ کات و کار و شوێن دەکەن بەیەکەوە ....هتد. بۆ نموونە وشەی ( زانا) ئاماژە بۆ واتای (زانین)

دەکات و کاتی تێدا نییە، بەڵام وشەی (دەزانم) ئاماژە بۆ کات و ڕووداو دەکات لە ئێستا و داهاتوو. مۆرفیم لەزماندا دوو ڕۆڵی گرنگی هەیە :

١- ڕۆنانی ووشە:

ئەم کارە پێشگر و پاشگر و بەجێ دێنن .

٢- گۆڕینی ڕێژەیی :

وشەکە کار ساز دەکات (٥٠) .

زیادکردنی مۆرفیم یان جیاکردنەوەی مۆرفیم یان بەرامبەرکردنی یان دیاریکردنی بۆ سێ جۆرە ئەرکە کە بریتین لە :

أ- ناساندن و دیاریکردن Identification :

پۆلینکردن و دیاریکردنی مۆرفیم دەگرێتەوە لە هەموو زمانێك، ئەمەش ژماردنی وردی ئەم مۆرفیمانە ناگرێتەوە، چونکە کارێکی وا هەموو وشەکانی زمانێك دەگرێتەوە کە لە فەرهەنگدا هەن بە ئامرازەکانیشەوە .

ب- پۆلێنکردن Classification :

مەبەستمان دەستنیشانکردنی جۆرەکانی مۆرفیم و سروشتییەتی لەم زمانە وەك :

أ- بنیاتی مۆرفیم و وێنەی دەنگی .

ب- واتای بنیاتەکەی ئەرکییە یان لێکسیکییە .

ج- دابەشکردن Distribuation :

لەسەر بیرۆکەی گۆڕینەوە و جێگرتنەوە Substituation کاردەکات کە یەکەیەکی زمانی شوێنی یەکەیەکی تر لە ژینگەیەکی زمانەوانی گەورەتر بگرێتەوە وەك (فۆنیم) بۆ (مۆرفیم) بۆ نموونە: گۆڕینەوەی (د) لە مۆرفیمی (دڵ) بە (م) کە مۆرفیمی (مل) پێکدێنێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە (د) و (م) فۆنیمن.

یان گۆڕینەوەی وشەی گوڵ لە رستەی :

- گولێکم کڕی . بە ( کاتژمێر ) کە دەبێتە:

– کاتژمێرێکم کڕی .

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە (گوڵ) و (کاتژمێر ) ناون. ئەمەش یارمەتیمان دەدات بۆ دەستنیشانکردنی بەشەکانی ئاخاوتن (51) .

## ٩- جۆرەکانی مۆرفیم لە زمانی کوردیدا :

پێشتر گوتمان زمانی کوردی لە نێوان نووساو تێکچڕژاوەکانە بۆیە دیاریکردنی مۆرفیم و جیاکردنەوە چەشنەکانی کارێکی ئاسان نییە تووشی زۆر تەگەرە دەبین، بۆیە لێرەدا ئێمە مۆرفیمەکان لە زمانی کوردی زاری ناوەڕاست دابەشدەکەین و دواتریش بابەتە کێشەدارەکان دەخەینەڕوو مۆرفیم لە زمانی کوردیدا دابەش دەبێ بۆ :



## یەکەم : مۆرفیمی لێکسیکی :

مۆرفیمە سەربەخۆکان دەگرێتەوە و دەبێتە دوو جۆر :

أ- سەربەخۆ :

هەموو وشە فەرهەنگییەکانی زمان دەگرێتەوە، وەك : ناو و ئاوەڵناو، ئاوەڵکار.....هتد .

ب- سەربەخۆی ئەرکی :

وشە ئەرکییەکان دەگرێتەوە، کە لە زمانی کوردیدا بە ئامراز ناسراوە وەك : و، لە، تا، .....هتد .

## دووەم: مۆرفیمی زیادە :

هەموو ئەو فۆرمە زیادانە دەگرێتەوە کە بە پێش و پاشی بنکەوە دەلکێت و ئەرکیان هەیە و پۆل دروست دەکەن و دەبنە و دوو جۆر :

### أ- گیرەك :

١- گیرەکی ڕێزمانی Inflection :

گیرەکە ڕێزمانییەکان ئەرکی ڕێزمانییان هەیە وەك: ناساندن و تێپەڕاندن و کۆ و کات .....هتد. پۆل نەگۆڕن واتە بخرێنە سەر وشەی تر پۆلەکەی ناگۆڕێت، زۆر جار هێز Stress وەرناگرن، هەندێکجاریش وەردەگرن وەك :

- کتێبەکەم

گیرەکی ڕێزمانی ئاشنایەتی زۆر لەگەڵ ڕەگ نییە، بۆیە دوور دەکەوێتەوە لێی وەك : ( گوڵ + دان + ەکە ) دەبینین (ەکە) گیرەکێکی ڕێزمانییە دوورکەوتۆتەوە لە بنج. ئەم جۆرە گیرەکانە ناوێزەیان کەمە، بۆ نموونە (تر، ترین ) دەچێتە سەر هەموو ئاوەڵناوێکی سادە . گیرەکە ڕێزمانییەکان بە پێی شوێن لە زمانی کوردیدا

دەبنە دوو بەش :

- پێشگر : وەك : ب، دە، نا، نە، مە.....هتد .

- پاشگر : اندن، ەوە، ێك،.....هتد.

٢- گیرەکی دارشتن Derivation:

هەموو ئەو پاشگر و پێشگرانە دەگرێتەوە کە وشە دادەرێژن، گیرەکەکانی دارشتن واتا و پۆل دەگۆڕن و ئاشنایەتیان لەگەڵ رەگ زیاترە و زووربەیان هێزیان لەسەرە وەك : ( باخ+چە) و ناوێزەی زۆریشان هەیە بۆ نموونە:( ۆلکە) تەنها لە (دۆلکە) دەبینرێت و ناتوانێت بچێتە سەر (پەرداخ) (پیاڵە) ....هتد . گیرەکەکانی دارشتن بە پێی شوێن لە زمانی کوردیدا دەبنە دوو بەش :

- پێشگر : بە، هەڵ، دا، بێ.....هتد .

- پاشگر : گەر، کەر، زان، وان......هتد .

### ب- نووسەك :

راناوە لکاوەکان و هەندێ گیرەکە رێزمانییەکان دەگرێتەوە وەك : م، ت، ن.....هتد، یان مۆرفیمەکانی ناساندن وەك، (ەکە)، مۆرفیمی (ان) کۆ....هتد.

١- بەرگر : لە کوردیدا نییە .

٢- دواگر : ەکە، ان، راناوە لکاوەکانی وەك: م، ت، ی .......هتد.

## ١٠- کێشەکانی مۆرفیم لە زمانی کوردیدا :

### أ- کێشەی بوون و نەبوونی هەندێ مۆرفیم :

هەندێ مۆرفیمەکان کێشەی بوون و نەبوونیان هەیە بەتایبەتی ناوگر و کۆنفێکس (جووتە مۆرفیم) :

## ١- کێشەی بوون و نەبوونی ناوگر :

کێشەی ناوگر زمانەوانانی کردۆتە دوو دەستە لە نێوان بوون و نەبوون، ئەوانەی دەڵێن هەیە نموونەی ( شەبەق، ئاسەوار، بزاوتن...هتد.) دێننەوە کە گوایە لە گۆڕانی (شەق) و ( ئاسار) دروست بووە، خوالێخۆشبوو (**محەمەد مەعروف فەتاح** ) پێی وایە هیچ لەم گۆڕانانەی سەرەوە رێکوپێك نین و لە ژینگەی تر دووبارە نابنەوە و وەك دیاریدەی ناوێزە سەیر دەکرێن، ئەگەر نموونەی دروستی ناوگریش بن وەك پاشماوەی کۆن دەبینرێت، سەرەڕای ئەمە ئەگەر ئەمانە ناوگربن دەبێت مۆرفیم بن دەبێت یان ئەرك یان واتای نوێیان هەبێت، ئاشکرایە هیچ لەم تایبەتیانەی سەرەوەیان نییە، چونکە هاوواتان لە زارێکی تر و گۆڕان لە واتا دروست ناکەن، ئەم دیاردانە لەوە دەچن گۆکردنی جیاوازی یەك وشەبن و بە پێی زاری ناوچەیی یان کۆمەڵایەتی بگۆڕدرێن وەك ( ساوەر ، ساوار ) و بە رێکەوت بنکەی وشەی هەڵتەکاندبێت و بەمە نابنە ناوگر، بەڵکو ( جیاوازی ئازاد ) یان پێدەگوترێت، کە واتا ناگۆڕن، بەڵام زانیاری لە بارەی قسەکەر دەدەن، جگە لەمەش بوونی ناوگر لەگەڵ سروشتی زمانی کوردی رێکناکەوێت، واتە ناوگر وەك کردەیەکی زیندوو و بەرهەمهێن لە زمانە لکاوەکان نابینرێت، ئەوەی رێگە دەگرێت نموونەکانی پێشووتر ببنە ناوگر ئەوەیە پەیوەندی رێزمانی یان دارشتن لە نێوان وشە بە ناوگر دوروستبووەکەوە و ئەو وشەیەی کە لێی وەرگیراوە نادۆزرێتەوە وەك :

- گژ : گرژ
- سپران : سپاردن

هەندێ لە نموونەکان زیاتر لە گۆڕانێکی مۆرفۆلۆجیان تێدەکەوێ وەك :

- برژان : برێشکە
- بوردن : بواردن

لێکدانەوەی نموونەکان نامانگەیەنێتە ئەوەی دەستوورێك بۆ دروستکردنی ناوگر بدۆزینەوە یان ئەرکێکی بدەینە پاڵ ڕێزمانی بێت یان دارشتن وەك :

بوردن : بواردن، ئەرکی تێپەڕی پێسپێردراوە (٥٢) .

## ٢- کێشەی کۆنفیکس ( جووتگر ) :

ڕۆژهەڵات ناسەکانی وەك: مەکەنزی و مەکارۆس، باس لە بوونی جووتەگیرەك دەکەن کە لە شێوەی پێشگر و پاشگر بە وشەوە دەلکێن، کە دەتواندرێت پێی بگوترێت گیرەکی داترازاو وەك ئەم نموونانەی خوارەوە :

أ – ئەم / ئەو ..........ە وەك : ئەم کوڕە ، ئەو کچە .

ب – لە/ بە .......... دا/ ەوە وەك : لە هەولێردا ، بە سلێمانیەوە .

ج – ب ...............ایە وەك : بهاتایە .

لەم نموونانەی سەرەوە ( أ ) کەرتی یەکەمی وشەیە نەك گیرەك و پێشگر، دەشێ نموونەی (ب، ج) کەرتی ی یەکەمی بە پێشگر بژمێدرێ ئینجا بە گیرەکی ترازاو بەم شێوەیەی خوارەوە :

أ– لێـ......... ەوە .

ب– پێـ......دا/ ەوە .

کە لەم رستانە دەبینرێت :

أ– لێمەوە دوورە .

ب– پێمەوە نایەت .

جیاکردنەوەی ئەم مۆرفیمانە لە زمانی کوردیدا گرانە، بۆ نموونە (ئەو، ئەم ) وشەیە و بە ئامرازی نیشانە ناودەبرێت، لەوانەشە مۆرفیمی ناسیاوی بێت، ئەگەر پێداچوونەیەك بۆ پاشگرەکانیان بکەین دەکرێت بە مۆرفیمی دۆخ (Case) سەیر بکرێن هەرچەندە لە زاری ناوەڕات لەناو چووە، بەڵام لە شوێنکی وا و بانگکردن و ناو شوێنەواری ماوە، بۆ نموونە دۆخی بەرکاری راستەخۆ لە کوردیدا تێچووە و

دۆخی بەرکاری ناڕاستەوخۆ کە ئاوەڵگوزارەیە بە هۆی ئامرازی بەندەوە بەڕێوە دەچێت واتە باری ئاوەڵگوزارەیی شوێن یان کات هەر پارێزراوە بەهۆی (ەوە، دا) واتە ئەمانە نیشانەی دۆخی کات و شوێنن وەك :

- لە بەیانیدا دەگەن .
- لەماڵەوە دێ .

کە لە رووی مۆرفۆلۆجییەوە بەم شێوەیە شیدەکرێنەوە :

لە ( مۆرفیمی ئەرکی) ئێوارە (مۆرفیمی سەربەخۆ) ەوە (مۆرفیمی بەند)

بەهەمان شێوە دەتواندرێت مۆرفیمی ترازاوی ( ب...ایە) ئەرکی ئیلزامی بدەینە پاڵ وەك :

- ئەگەر بهاتبایە ئەمان دی .

لە رووی مۆرفۆلۆجییەوە (بهاتبایە) بەم شێوەیە شیدەکرێتەوە :

ب (بەند) ها (بنکەی بەند) ت ( بەند، رابردوو ) بایە ( مۆرفیمی مەرجە) (٥٣) .

## ب- کێشەی جیاکردنەوەی مۆرفیمەکان :

### ١- جیاکردنەوەی گیرەکی وشە دارێژ و رێزمانی :

بێگومان هیچ دابەشکردنێکی ورد ناتوانێت هێڵێکی راست بە نێوان جۆرەکانی مۆرفیم دابنێت لەم دابەشکردنە وردەدا تووشی هەندێك تێکچڕژان و ئاڵۆزییەك دەبین لە جیاکردنەوەی گیرەکە رێزمانی و دارشتنەکان لەوانەش :

أ- هەرچەندە مۆرفیمی ( ان) مۆرفیمێکی رێزمانییە، بەلام لە وشەیەکی وەك ( گولان ) ناوی دارێژراوی دورستکردووە، بە هەمان شێوەش چەمکی کۆ دەدات، لێرەدا نازاندرێت بەکام مۆرفیم دابنرێت گیرەکی رێزمانی یا دارشتن .

ب- ( ن ) مۆرفیمێکی رێزمانیە، ( کار ) دەگۆرێت بۆ (چاوگ ) کە دەتوانرێت وەك ناو رەفتاری لەگەڵ بکەین (٥٤) ، جگە لەمانە دەچێتە سەر ناو و ئاوەڵناو

دادەڕێژێت وەك : ( توك +ن ) : ( توكن ) یان وەك : هاتن .....هتد.

ج– مۆرفیمی (ەوە) کە بە دوای کارەوە دەلکێت و بە مۆرفیمی ڕێزمانی دادەنرێت، چونکە رووکار دەنوێنێ دەشێ وا سەیر نەکرێت، چونکە پاش جێناوە لکاوەکان دەکەوێت کە خۆیان بە مۆرفیمی ڕێزمانی دادەنێن، کەواتە لە نموونەی : دەگەڕێمەوە. دوو تایبەتی مۆرفیمی ڕێزمانی تیاچووە :

١– دوو مۆرفیمی ڕێزمانی ناچنە سەریەك .

٢– مۆرفیمی وشە دارێژ لە پێکهاتەی وشەدا پێش ڕێزمانی دەکەوێت .

د– مۆرفیمەکانی بچووك کردنەوە، کە بۆ خۆشەویستی یان بچووك کردنەوە بەکاردێت، لە نێوان مۆرفیمی ڕێزمانی وشەدارێژ دایە، چونکە بە ڕێك و پێکی بە هەموو ئەو وشانەوە دەلکێن، کە دەتوانن لەگەڵیدابن و بەشە ئاخاوتنی بنکە ناگۆڕن، بەڵام لەوەی کە وشەی نوێ و بیری نوێ دێنێتە کایەوە دەبێت وەك مۆرفیمی وشەدارێژ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت .

ه– مۆرفیمی لێکترازاوی (ە) لە مۆرفیمەکانی نیشانە، نە مۆرفیمێکی وشە دارێژە نە مۆرفیمێکی وشە گۆڕ، نەواتای هەیە و نە ئەرك، چەندین مۆرفیمی تر وەك : (دا، ەوە) ی دوای لە وەك :

– لە ژوورەو ە .

– لەماڵەوە دا (٥٥) .

## ٢- کێشەی جیاکردنەوەی گیرەك و نووسەك :

١– نووسەك بە وشەوە نالکێت بەڵکو بە گرێوە دەلکێت، گیرەك بە وشە یا بنکەوە دەلکێت وەك :

– پارەکەم برد : بە بەرکارەوە لکاوە .

– بردم : بە کۆتایی کارەوە دەلکێت .

- دەم گری : بە مۆرفیمی رووکارەوە لکاوە .
- نەم گری : بە نەریّ لکاوە .
- زۆرم گرت : بە ڕادەوە لکاوە
- لێم سەند : بە ئامرازی بەندەوە لکاوە .

بە پێچەوانەوە دەبینین گیرەکی ڕێزمانی ( دە، نا، نە ) بە ڕەگەوە لکاون ...هتد بەڵام (نە) پێشدەکەوێت. پاشگرە وشە داڕێژەکان هەریەکەیان بەشێکی ئاخاوتن هەڵدەبژێرێت و بە وشەکەوە دەلکێت وەك : ئاسنگەر، دووکاندار.....هتد.کەچی دەبینین نووسەکی (ەکە) بە دوا کەرستەی گریّ وە دەلکێت وەك :

- خانووە جوانە بەرزە گەورەکەی بە دڵە .

٢- نووسەك بە زۆری خاوەنی دوو مۆرفیمە یان زیاتر، وەك جێناوەکان کە سەربەخۆ و بەندیان هەیە، هەرچەندە سەربەخۆکە بۆ جەختکردن و بەراوردکردن بەکاردێت، بە پێچەوانەوە گیرەکەکان بە زۆری یەك فۆرمیان هەیە وەك :

- من دێم ئەو نایەت .

بەڵام دەبینین گیرەکی نەناسیاوی دوو فۆرمی هەیە ( ێك، یّ) وەك: ( پیاوێك، پیاویّ ) .

٣- گیرەکی ڕێزمانییەوە نووسەك دەتوانێت بە بنکەیەوە بنووسێت کە نووسەکێکی تری تێدابێت واتە لەیەك پێکهاتە دەکرێت چەند نووسەکێك هەبێت وەك : کوڕەکانیانم بینی

- کوڕ + ەك + ان + یان + م بینی . چوار نووسەك لە دوای یەك هاتوون .

گیرەکی ڕێزمانی بە هەمان شێوە دەچنە سەریەك وەك :

- هونەر + مەند + ێتی خواکردە

٤- ناوێزەیی واتایی لە گیرەکی ڕێزمانی و وشەداڕێدا هەیە و لە نووسەك نییە، بۆ نموونە: (م) : هەر بە واتای من دێت ناگۆڕێت. لە بەرامبەر ئەمەدا زۆر ناوێزەی

واتایی لە گیرەکە ڕێزمانی و دارشتنەکان بەدی دەکرێت وەك پاشگری ( وولـە) کـە بۆ بچووکردنەوە بەکاردێت دەبینین هەندێ جار بەکارنایـەت و ئـەو واتایـە نـادات وەك لە وشەکانی: دانوولە، مێشوولە، ...هتد (٥٦) .

هەموو ئەوانەی باسکران جۆرە ئاڵۆزییەك و ورییاییەکی دەوێت بۆ جیاکردنەوە و کێشـەی جیاکردنـەوەش هـەر بـەردەوام دەبێـت، بۆیـە وا بـە گونجـاو دادەنرێـت دابەشکردنێکی بابەتییانە بە پێی سروشتی زمانی کوردی بۆ مۆرفیم بکرێت .

## ١١- دابەشکردنێکی بابەتیانەی مۆرفیمەکانی زمانی کوردی :

لـە دابەشـکردنەکانی پێشـووتر بـاس لـە چـەند جـۆرە مۆرفیمێـك کـراوە کـە هەنـدێکیان لـە زمـانی کـوردی دا نـین وەك : نـاوگر و کـۆنفێکس و کێشـەی جیاکردنەوەی نووسەك و گیرەکی ڕێزمانیش بە تەواوەتی سـاغ نابێتـەوە بۆیـە بـە پێویسـت دەزانرێـت بـە پێـی سروشـتی زمانەکـە ئـەم دابەشـکرنەی خـوارەوە بـۆ مۆرفیمەکانی زمانی کوردی بکەین بەو پێی مـۆرفیم دەبێـت خـاوەن ئـەرك و واتـا بێت :



## یەکەم : مۆرفیمی سەربەخۆ :

### أ- مۆرفیمی لێکسیکی :

ئەم مۆرفیمانە سەربەخۆ وەك دەردەکەون و واتادارن وەك : ئاو، گوڵ،....هتد .

### ب- مۆرفیمی ئەرکی :

ئەو مۆرفیمە سەربەخۆیانە دەگرێتەوە کە واتایەکی ئەرکییان هەیە وەك : بۆ، لە، .....هتد .

## دووەم: مۆرفیمی بەند :

ئەو مۆرفیمانە دەگرێتەوە کە ئەرکی ڕێزمانیان هەیە لە گەردانکردن و دارشتن و لێکدان و دەبنە دوو بەش :

### أ- بەندی گەردانیکردن :

ئەم مۆرفیمانە دەگرێتەوە کە ئەرکی گەردانیکردن دەگرنە ئەستۆ و بە سەرەتا و کۆتای دەلکێت وەك :

١- بەرگر :

ئەو مۆرفیمە ڕێزمانیانە دەگرێتەوە، کە بە سەرەتاوە دەلکێت و بریتین لە :

- ( دە ) بەردەوامی :
- (ب) فەرماندان :
- (نە، نا، مە) نەرێکردن :

٢- دواگر :

- ( ەکە ) ناساندن : پیاوەکە
- ( ێك، یٚ ) نەناسراو : گولێك

- ( ان، ات، ها،گەل، وات....هتد ) کۆ : کوڕان، ساڵەها، ....هتد .
- (ە،ێ ) رەگەز : کوڕە ، کچێ .
- (ۆ، ۆك ، ۆکە...هتد ) بچوککردنەوە: کوڕۆ ، جامۆکە، ماڵۆکە،حەمەدۆك.... هتد .
- (ڕ) بکەر نادیار : دڕا، شکێنرا ، دەکوژرێ .....هتد .
- کات : (رابردوو : ت،و،د،ی،ا) و ( داهاتوو:ێ ) و (ئێستا: ە ) وەك : کەوت، دەچێ، هەمە........هتد .
- جێناوە لکاوەکان وەك :م،ت،ی، ......هتد .
- ( اندن ) تێپەڕاندن : شکاندن، سوتاندن، ......هتد .

## ب- بەندی دارشتن :

### ١- پێشگر :

- نا : نابینا
- پێ : پێخۆر
- را : رایەڵ
- بەر : بەرماڵ
- هاو : هاودەنگ
- نە : نەمر
- بە : بەکوڵ
- بێ : بێهۆش

............. هتد . ( لە پۆلە فۆمەکان نموونەی زیاتر خراوەتە ڕوو )

## ٢- ناوبەند :

ئەو مۆرفیمانە دەگرێتەوە کە وشەی لێکدراو دروست دەکەن .

- و : جل و بەرگ
- ی : ماڵی پاشا
- ە : پیرەمێرد

## ٣- پاشگر :

- دار : دڵدار
- وان : گاوان
- ەوان : باخەوان .
- گەر : مس گەر .
- ساز : کارساز .
- چی: قومارچی .
- مەند : هۆشمەند .
- کەر : ئیشکەر .

..................هتد ( لە پۆلە فۆمەکان نموونەی زیاتر خراوەتە ڕوو )

## پەراوێزەکانی بەشی یەکەم :

١- اجتماع خبراء المحللات الحاسوبية الصرفية للغة العربية دمشق ٢٦-٢٧/٤/٢٠٠٩

٢- ( محەمەد مەعروف، صەباح رەشید: ٢٠٠٦:٩٠)

٣- ( زێرین خورشید سەلیم: ٢٠١٢:٦٦)

٤- (لطفی عزیزة امین:٢٠١٠:٥٦)

٥- (محمد علی الخولی:١٩٩١:١٧٦)

٦- ( ئەورەحمان حاجی مارف: ٢٠٠٤: ١٧٣)

٧- (Bloom Field:1933:161)

٨- (حسن جمعة:٢٠٠٢:٢١) .

٩- (ستیڤن ئۆلمان: ١٩٨٨:٦٩) .

١٠- (R.W.Langacher:1973:75)

١١- (Lyons:1977:181)

١٢- (Robins:1978:192)

١٣- (Ben Crane:1981:225)

١٤- (H.Greenberg Joseph:1961:18)

١٥- (محمد خير حلواني : المغني الجديد في علم الصرف: ١٥) .

١٦- (Lyons,semantics:1977 : 18)

١٧- ( ١٩٩: Lyons, introduction theoretical linguistics:1977 )

١٨- (Bloom field:1933 :178)

١٩- (وریا عومەر ئەمین:١٩٨٦:١٠)

٢٠- مفهوم الكلمه:
http://www.aklaam.net/newaqlam/index.php?option=com

٢١- (محمد علی الخولی:٢٠٠٠:٦٩) .

٢٢- (محەمەد مەعروف فەتاح:١٩٩٠:٩٥)

٢٣- (محمد علی الخولی :٢٠٠٠:٨٣)

٢٤- (محمد علی الخولی :٢٠٠٠:٨٠)

٢٥- (محمد علی الخولی :٢٠٠٠:٧٩)

٢٦- (محمد علی الخولی :٢٠٠٠:٨١)

٢٧- (زێرین خورشید سەلیم:٢٠١٢:٦١)

٢٨- (محەمەد مەعروف فەتاح و صباح رەشید:٢٠٠٦:١٥)
٢٩- ( ئەورەحمان حاجی مارف : ١٩٨٧ : ٢٤)
٣٠- (عادل محمد عبدالرحمن الشنداخ:٢٠٠٧:٨٧)
٣١- ( يوسف معاش:٢٠٠٨:٣٨)
٢٣- (محمد معروف فتاح: ١٩٩٠ :٧١).
٣٣- (كوردستان موكرياني ٢٠٠٠ : ١١)
٣٤- ( ئەورەحمان حاجی مارف : ١٩٨٧ : ٢٤ تا ٢٥)
٣٥- ( ئەورەحمان حاجی مارف : ١٩٨٧ :٣٤).
٣٦- (صباح رەشید قادر:٢٠٠٩:٣٨)
٣٧- ( وريا عومەر ئەمین :١٩٨٩:١٦٦)
٣٨- (وريا عومەر ئەمین : ١٩٨٩: ١٦٦)
٣٩- (ماريۆ پای :١٩٩٨:١٠٧)
٤٠- ( زێڕین خورشید سەلیم: ٢٠١٢:٧٣)
٤١- ( زێڕین خورشید سەلیم: ٢٠١٢:٧٣)
٤٢- ( زێڕین خورشید سەلیم: ٢٠١٢:٧٤)
٤٣- ( عبدالواحد مشیر دزەیی: ٢٠٠١: ١٢٤،١٠٠،٧٧،٥١ )
٤٤- ( عادل محمد عبدالرحمن الشنداخ:٢٠٠٧:٨٩) .
٤٥- ( عادل محمد عبدالرحمن الشنداخ:٢٠٠٧:٨٨)
٤٦- (محمد معروف فتاح : ٢٠٠٦ : ٢٩)
٤٧- (لطفی عزیزة:٢٠١٠: ٢٥ )
٤٨- ( الصوتيات والفونولوجيا ، مصطفى حركات - ص ٨ )
٤٩- (مصطفى حركات ، اللسانيات العامة وقضايا العربية:٦٤)
٥٠- (ئەورەحمان حاجی مارف : ١٩٨٧ : ٣٠-٣١)
٥١- علم مورفولوجيا: http://www.onefid.edu.duz
٥٢- ( محەمەد مەعروف فەتاح و صەباح رەشید:٢٠٠٦:٣٨) .
٥٣- ( محەمەد مەعروف فەتاح و صەباح رەشید:٢٠٠٦:٣٦ -٣٧) .
٥٤- ( محەمەد مەعروف فەتاح و صباح رەشید :٢٠٠٦:٣١)
٥٥- (محەمەد مەعروف و صەباح رەشید:٢٠٠٦:٣٢)
٥٦- (محەمەد مەعروف و صەباح رەشید:٢٠٠٦:٣٤)

## بەشی دووەم : بەشەکانی ئاخاوتن Part of speaks :

بەشەکانی ئاخاوتن لە هەموو زمانیکی زیندووی سەر گۆی زەوی دا هەیە، ئەم بەشانەش کەرەسەی هەرە گرنگی زانستی ( وشەسازی ) ن . بۆیە هەندێك لە زانایانی زمانەوانی رایان وایە، کە بەشەکانی ئاخاوتن بە پێی ( ئەو واتایەی کە هەیەتی ، گۆرانی کەرەستەکە، چۆنیەتی بەکارهێنانی لە بواری( رستەسازی) دا دروست دەبن .

### ١- ناو Noune :

#### أ- پێناسەی ناو :

بەشیکی گرنگە لە بەشەکانی ئاخاوتن و تا ئیستا چەندین پێناسەی بۆ کراوە ، ئەم پێناسانەش هەندێك مەبەستیان پێکاوە و هەندێك جاریش لە کرۆکی ناساندنی پێناسەیەك بۆ ناو نزیك بوونەتەوە لەوانە :

– ناو : وشەیەکە بۆ ناو نانی کەسی یان شتێك بەکار دەهێنری ، وەك : شاسوار ، گەلاوێژ ، هەلۆرە ، بەراز ، دمۆك (١) . دەکرێت بلێین ئەم پێناسیە ساکارترین پێناسەی ( ناو )ە، چونکە سروشتییە کە ( ناو ) بۆ ناونان و جیاکردنەوەی کەسێك یان شتێك بەکاردەهینرێت لەو دەوروبەرەی کە مرۆڤ تیادا دەژیت .

– ناو : ئەو وشەیەیە سەربەخۆ واتایەك دەگەیەنیت کە بە کاتەوە نە بەستراوە، وەك : کاوە ، سالٌ ، بەرد ، پیاوەتی ، هەولێر ، رۆیشتن ، گولٌ ، پەپوولە ، فرۆکە ، بەستەڵەك ، هەڵپەرکی ، تێهەلْکێشان ....هتد. (٢) . ناو جگە لەوەی کە واتایەکی تەواو دەدات بە دەستەوە ، واتاکەی هیچ پەیوەندیەکی بە کاتەوە نییە ، چ لە رابردوو ، ئیستا، داهاتوو دابێت ، چونکە ئەگەر سەرنجی ناوەکان بدەین تێبینی هیچ کاتێك ناکەین .

– ناو : ئەو بەشەی ئاخاوتنە، کە کاتیگۆری ڕێزمانی ناسیاوی ، نەناسیاوی ، کۆ ، رە سەن و دۆخ دەگرێتە خۆی (٣) .

– ناو : بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن ، کاتیگۆری ڕێزمانی ناسیاوی ، نەناسیاوی ، رەسەن ، ژمارە و دۆخ واتایی شت دەبەخشن (٤) .

لەم دوو پێناسەیەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت، کە سروشتی ناو وایە کە کۆمەڵێك مۆرفیمی ڕێزمانی وەردەگرێت و لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر دەگۆڕێت ، بۆ نموونە ئەگەر ناو لە باری نەناساوی دابێت، ئەوا بە وەرگرتنی مۆڕفیمی ( ەکە ) دەچێتە باری ناسیاوی ، یان بە وەرگرتنی مۆڕفیمی ( ان ) ئەلۆمۆڕفەکان لە باری تاکەوە دەچێتە باری کۆ ..... هتد. بۆیە ئەو مۆڕفیمانەی کە ناو پیشان دەدەن، هەندێکجار دەکەونە دوای ناوەوە، هەندێکجاریش دەکەونە پێشەوەی ناوەوە .

– ناو ئەو وشەیەیە کە ناوی گیانداریك یان بیریك یان کارێك دیاری دەکات، وەك : ژن ، بەرد، خەم، درومان (٥) . لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو پێناسانەی بۆ ناو کراون هەموویان تا رادەیەکی زۆر لە یەکتری دەچن و هەمان بیرۆکە لە پێناسەکاندا دووبارە بۆتەوە، وەك : ناونانی کەس و شت و بیر ....... هتد، بەڵام ئەو پێناسەی کە تا ڕادەیەك گونجاوبێت ئەوەیە کە دەڵێت :

– ناو : ئەو ووشەیە کە بۆ ناو نانی کەسێك یان گیانداریك یان شوێنێك یان ڕووداوێك یان شتێك یان ئەوانەی کە بوونی بەرجەستەییان نیە و بە هۆی بیر و ئەندیشەوە هەستیان پێدەکریت، بەکاردەهێنرێت (٦) .

## ب- جۆرەکانی ناو :

ناو بەگەلێك شێوە دابەش دەکرێت ، بۆ نموونە هەندێکجار لە رووی پێکهاتەوە دابەش دەکرێت بۆ ( ناوی سادە، ناوی ناسادە ) هەندێکجاریش لە رووی واتاوە دابەش دەکرێت بۆ ( ناوی تایبەتی ، ناوی گشتی ، ناوی کۆمەڵ ) ئەمانەش

دەکەونە خانەی ناو لە رووی چەمکەوە، بەڵام بە مەبەستی لێکۆڵینەوە بۆ جۆری تریش دابەشکراوە :

یەکەم: ناو لە روی پێکهاتەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە :

ا- سادە

ب - ناسادە (٧) ناسادەش کە دەکرێتە دوو بەش :

أ- لێکدراو

ب- دارێژراو (٨)

لە رووی فۆرمەوە دەبێتە سێ بەش :

أ- سادە

ب- لێکدراو

ج- دارێژراو .

ناوی سادە تاکە ووشەیەکە و هیچ زیادەیەکی پێوە نییە و واتای تەواوی هەیە، بەڵام ناوی دارێژراو لە ناوێکی سادەی واتادار و زیادەیەك (پێشگر پاشگر) یا هەردوو کیان پێکدێت .هەرچی ناوی لێکدراوە لە دوو ووشەی واتاداری سەربەخۆ دروست دەبێت، هەندێکجار بەهۆیی ناوبەندەوە پێکدێت .

أ - ناوی سادە :

ئەو ناوەیە کە لە ووشەیەك پێکهاتووە بەبێ بوونی پێشگر و پاشگر، وەك : ساڵ ، ئاو ، کچ ، کور ،......هتد .

ب- ناوی لێکدراو :

ئەو ناوەیە کە بەلایەنی کەمەوە دوو ووشەی واتاداری تێدابێت ، وەك دڵشاد، رووپاك ، گوڵەگەنم ، شەکرەسێو ،.....هتد (٩). ناوی لێکدراو بەچەند رێگایەك دروست دەبێت: یا دووناوی سادە ، ناوێکی سادە و ئاوەڵناوێك، ناوێکی سادە و رەگی کردار، دوو رەگی کردار، ئاوەڵکردار و ناوێکی سادە ، ناوێکی سادە و

وشەیەکی بیّ واتا، دووبارەکردنەوەی ناویّك. وەك چەرمەگا ، شـاهەنگ ، رەشمـالّ ، دارتاش ، دەستوبرد ، هاتوچۆ، پاشەڕۆژ ، گژوگیا ، ملّچەملّچ ،....هتد (١٠) .

ج– ناوی داڕێژراو :

ئـەو نـاوە سـادەیەیە کـە تـەنها وشـەیەکی واتـاداری تێدابێت، وەك : داسـولکە پیاوەتی ، ملوانکە، هەلّکەوت ، داهات ،....هتد (١١). ئەو پاشگرانەی دەچنە سەر ناو ئاوەلّناو و ئاوەلّکار ...هتد. دەیانکەن بە ناوی داڕێژراو بریتین لە: ( گـەر ، دار ، مەند، ایەتی، ستان ،خانە، یلە ، ە ، مەنی، ار ، بار، اك ، پیّ،.....هتد.) وەك :

– ناو ، وەك : ( گیاندار ، هونەرمەند ،....)

– ئاوەلّناو، وەك : ( جوانی بلّندایەتی،....)

– کار ، وەك : (وتار ،پرسیار،....)

– ئاوەلّکار، وەك : (پێشەوا ،بەرۆك،...)

– رەگی کار، وەك : ( پێویست ، بەرچنە،......) (١٢).

هەروەها ناو لەرووی تایبـەتی و گشـتی و ژمـارەوە دابـەش کـراوە بـۆ سـێ بەشـی سەرەکی : گشتی و تایبەتی و کۆمەلّ، (١٣) وەك :

| | |
|---|---|
| أ– هەولێر شارێکی گەورەیە . | (شار) ناوێکی گشتی یە . |
| ب– نەسرین ئافرەتێکی رۆشنبیرە . | ( نەسرین) ناوێکی تایبەتی یە . |
| ج– گەلی کورد گەلێکی رەسەنە. | ( گەل) ناوێکی کۆمەلّە. |

دووەم : ناو لەرووی رەگەزەوە دەکرێت بە چوار بەشەوە :

أ– نێر وەك : بەران .

ب– میّ وەك : ماین .

ج– بیّ لایەن : خانوو

د– دوولایەن : دۆست دوو لایەن ) (١٤)

سێیەم : ناو لەرووی سەربەخۆیی هەبوونەوە (بوون) دەکرێت بەدوو بەشەوە:

أ- مادی وەك: خوێ ، گەدە ، زێڕ

ب- واتایی یا مەعنەوی وەك : پیاوەتی، هێز ، چاکە (١٥) .

مەبەست لە ناوی مادی ئەو شتانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ دەتوانێ بە پێنج هەستەکەی خۆی هەستیان پێ بکات، لە رێگای هەستەکانی ( بینین ، بیستن ، بۆنکردن، دەست لێدان ، تام کردن ) . هەروەها زۆربەی کاتەکان بوونی مادیان هەیە لە بۆشایی دا، بەلاّم ناوی واتایی ئەو شتانە دەگرێتەوە، کە بوونی مادیان نیە، بەلّکو لەرێگایی ئەو شتانەوە کە بەر هەستەکان دەکەون ، یا لە خەیالّی مرۆڤدا شێوەیان بۆ دروست دەبێت، هەستیان پێ دەکرێت. ناوی واتایی لە بنچینەدا دوو جۆری هەیە، وەك ( بنجی ، درووست کراو ) بنجی وەك : باوەڕ ، جەنگ ، هۆش، ....هتد. ناوی دروست کراو دوو جۆرە :

أ- دروست کردنی لە ناوەوە ، وەك : کورد + ایەتی = کوردایەتی.

ب- دروست کردنی لە ئاوەلّناو ، وەك : جوان + ی = جوانی (١٦) .

## ٢- جێناو Pronouns:

### أ- پێناسەی جێناو :

ئەو مۆرفیمانەن کە ئاماژە بۆ کەس دەکەن و لە بری کەس بەکاردێن .

### ب- جۆرەکانی جێناو :

جێناوەکان دەبنە دووبەش :

- جێناوە سەربەخۆکان : وەك : (من، تۆ، ......هتد ) .
- جێناوە لکاوەکان : وەك : ( م ، ت ، یت ......هتد ) .

لە زاری ناوەراستدا سێ دەستە راناوی لکاو هەن، ستوونی (١) کە خاوەنییەتی نیشاندەدات، شت دەستەی رێکەوتن هەروەها لەگەلّ رابردووی تێپەڕیش دێت و

ستوونی (٢) لەگەڵ رابردووی تێنەپەڕ دێت و ستوونی (٣) لەگەڵ رانەبردوودا دێت(١٧) .

| جودا | | | لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | کەس | | ١ | ٢ | ٣ |
| تاک | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | ـ | ات- ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

## ٣- ئامراز Tools :

### أ- پێناسەی ئامراز :

هۆیەکە بۆ گەیاندنی مەبەست و بەستنەوەی وشەکانی ناو رستە بە پێی پێویست (١٨)، زۆر جار ئامرازەکان جگە لەو ئەرکەی بۆی دانراوە ئەرکی تریش دەبینن .

### ب- جۆرەکانی ئامراز :

١– ئامرازە ئاوەڵکارییەوەکان :

– لە : لە بازاربووم (دەرخستنی شوێن )

– بە : گەیشتیت بەچی ؟ ( ئەنجام)

– بۆ : دەڕۆن بۆ سەیران (جولانەوە)

– تا: تا ئەو مارکێتە چووم (کۆتایی جوولە) (١٩) .

٢– ئامرازە لێکترازاوەکان :

– لە..وە...تا... : لە ماڵەوە تا زانکۆ . ( سەرەتا و کۆتایی جوولانەوە )

- لە...دا : لە جەژن دا ئۆتۆمۆبیلەکەم فرۆشت ( لەناو)
- لە...ڕا : لە بازێڕ ڕا هاتم . (لەناو )
- لە ...وە : لە قوتابخانەوە هاتم . (لەناو)
- بۆ...بۆ : ئەوەندەی بۆ تۆ و دوو ئەوەندەشی بۆ ئەو (دابەشکردن ) .
- بە ....وە: بە پێوە نان دەخوات . ( دەرخستنی شێوە )

٣- ئامرازەکانی بەستنەوە Conjunction :

- و : سۆلاڤ و زاوێتە دوو شوێنی دڵتەزێنن .
- ش : منیش وەك تۆ تێنووی سەرکەوتنم .
- بەڵام : ئاهەنگ زیرەکە، بەڵام ناخوێنێت .
- نەك : دڵی مەشکێنە نەك نەیبینیتەوە .
- نەبا : بیری بخەرەوە نەبا لە بیری بچێت .
- یا : نازانم بیر لە چی دەکاتەوە لە ڕۆیشتنن یا لەماڵەوە (٢٠) .
- ی : برای مامۆستای کوڕی خوشکم هات .
- ە : درەختە بەرزەکان (٢١) .

٤- ئامرازی پرسیار :

- کێ : کێ دەزانێت چوو بۆ کوێ ؟.
- چی : ئەوە چی یە ؟
- چ : چ کاتێك دەستت بەتاڵە ؟
- ئاخۆ : ئاخۆ گەیشتبیتە کوێ ؟
- کەی : کەی هەست بە ماندوویی دەکات ؟
- چۆن : چۆن هاوڕێیەتی وا دەبێت ؟
- بۆ : بۆ لێی ناپرسیتەوە ؟
- بۆچی : بۆچی تاقیکردنەوەت دواخست ؟

- چما : چما پێشتر نایناسیت ؟
- کویّ : کویّ بەباش دەزانیت ؟
- لە کویّ : لە کویّ بوویت ؟
- کوا : کوایت ؟
- چەند : چەند زمان دەزانیت ؟
- بەچەند : ئەم مۆبایلەت بە چەند کڕی ؟
- کام : کام ساڵ کۆلیژت تەواوکرد ؟
- ئایا : ئایا دەتوانی یارمەتی بدەیت ؟ (٢٢)

٤- ئامرازی مەرج :

- ئەگەر : ئەگەر ناچیت خۆم دەچم .
- کە : کە بەڵێنی دا دەبێت بیبباتە سەر .
- تا : تا ماوم چاکەیم بیرناچێت .
- ئەگینا : بخوێنە ئەگینا پەشیمان دەبیتەوە. (٢٣)

٥- ئامرازی داخوازی :

- خۆزگە : خۆزگە هەموو کەسێك بە خۆشی دەژیا .
- بریا : بریا ئەو قسەیەی نەکردبایە
- کاشکی : کاشکی دڵم نەدەشکاند .
- بەڵکو : بەڵکو بەم زووانە بێتەوە .
- بەشکو : بەشکو ئەمە خوایە ئەم جارەش دەرچێت (٢٤) .

٦- ئامرازی سەرسوڕمان :

سەسوڕمان (ئاخ، ئۆف، وەی، ئۆخ، داد، ئەمان، وەیرۆ، هەیرۆ، پەکو....) بۆپەژارەو ئازار دەربڕین

- ئاخ لە دەست نەبوونی !

– پەکو کەی مرد !

٧– ئامرازی سەرنج راکێشان و بانگکردن :

(ئەریٚ، ئەی، هۆی، هاوار، ئەها ....) بۆ سەرنج راکێشان و بانگکردن (25) .

– ئەریٚ کارەبا نەهاتەوە ؟

– هۆ کابرا .

– ئەها پارەکەی دزی .

جگە لەمانەش ناو و نازناویش بۆ بانگکردن دەست دەدات وەك :

– کاکە چ دەکەی ؟

– دایە چمان هەیە ؟

– چاوان دەوەرە .

٨– ئامرازی تەوس و سوکایەتی پێکردن :

(شیرِ، ترحێو، دۆیها، حەی، هۆیها،...) بۆ تەوس و گاڵتە پێکردن .

– حەی لە و قسەیەی ؟

– دۆیها دۆیها......... .

## ٤- ئاوەڵناو Adjective:

### أ- پێناسەی ئاوەڵناو :

بەشێکی ئاخاوتنە شێوە و جۆری شت پیشان دەدات وە بە کاتەوە نەبەستراوە، مرۆڤ زۆربەی نرخاندن و هەستەکان خۆی ڕاستەوخۆ بەئاوەڵناو دەردەبڕیٚ. کە وەسفی بارودخ و کەس شت دەکات، مرۆڤ لە ڕێگەیانەوە هەست و هەڵوێستی خۆی پیٚ دەردەبڕیٚ (26) .

## ب- جۆرەکانی ئاوەڵناو :

بەپێی لێکۆڵینەوە زمانەوانیەکان سێ جۆرە ئاوەڵناو لەزمانی کوردی دا هەیە(27) :

### یەکەم : جۆرەکانی ئاوەڵناو لە رووی رواڵەتەوە :

١- ئاوەڵناوی بارستایی :

ئەم جۆرە ئاوەڵناوە جووت جووت دەوەستن و پلە هەیە لە نێوانیان دا و لە پرسیاردا بێ لایەنن وەك (گەورە، بچووك، درێژ، کوورت) .

٢- ئاوەڵناوی ڕەنگ :

پێکهاتووە لە کۆمەڵێك ڕەنگ لەدەوری چەقێکدا کۆدەبێتەوە و بوارێکی واتایی پێکدێنن و ئەندامەکانیش لە نێوان خۆیاندا جیاوازن، وەك : زەرد، سەوز، شین، ڕەش، سپی، مۆر، سور، خاکی،......هتد .

٣- ئاوەڵناوی ڕواڵەت :

ئەم جۆرە ئاوەڵناوە تایبەتی کەس و شت دەردەخەن، هەندێکیان جووت جووت دەوەستن وەك (گران، هەرزان،..)، هەندێکیان بەتاك دێن وەك : ( ئازا ، بەجەرگ، نەبەرد،.. ) و هەندێك هاوواتایی گرێ یان دەدات وەك (چاك ، باش )، هەندێکی تر دژواتایی گرێیان دەدات وەك ( تاڵ ، شیرین ) ئەو ناوانەی کە وەك دیارخەر کاردەکەن بەهەمان شێوە هەڵگری چەمکی ئاوەڵناون وەك :

وەك: - بە پەرداخێکی کریستاڵ ئاوم خواردەوە .

- کچەکە گوارەیەکی (زێڕ) ی کڕی

ڕادە هێزی کاریگەری ئاوەڵناو زیاتر دەکات (28)، وەك ( هەموو، یەکجار، گشت، فرە، زۆر،....) چونکە ئاوەڵناوەکە بەرزدەکاتەوە .

وەك: - کچێکی جوانی خواست.

– کچێکی زۆر جوانی خواست.

– کچێکی یەکجار جوانی خواست.

## دووەم : جۆرەکانی ئاوەڵناو لە رووی دارِشتنەوە :

١– سادە :

ئەو جۆرەکانی ئاوەڵناوەیە بە بە تەنیا لە یەك ووشە پێك هاتبێ واتە ( بێ پاشگر و بێ پێشگر )

٢– ناسادە :

ئەو ئاوەڵناوەیە لە وشەیەك و بەندێك وە یان دوو وشە پێکهاتبێ بۆیە ناسادە دەکرێ بە دوو بەش :

أ– ئاوەڵناوی دارِژاو :

لە ووشەیەکی سادە لەگەڵ پێشگرێك یاخود پاشگرێك دروست دەبێت یان هەندێك پێشگر و پاشگر هەن دەچنە سەر ( ناو ، ئاوەڵناو ، کردار ) ی سادە، وەك :

– ( ئاوەڵناو + پاشگر ) ، وەك : توکن ، وورگن ، ترسنۆك .

شێوەیەکی تریش هەیە بۆ دروست بونی ئاوەڵناوی دارِژاو وەك :

– ( پێشگر + ئاوەڵناو ) وەك : ناخۆش ، بەجەرگ ، بێ هێز ....هتد.

ب– ئاوەڵناوی لێکدراو :

ئەمەش بریتیە لە لێکدانی دوو ئاوەڵناوی سادە یان دوو ووشەی واتاداری سادە .کە شێوەی دروست بونەکەی زۆر شێوەی هەیە کە ئەمانەی خوارەوەن وەك :

– ناو + ئاوەڵناو : دڵ خۆش

– ناو + ناوی بەرکار : سەر شکاو

– ناو + ناو : بەژن چنار

– ناو + بە + ناو : لێو بە بار

- ناوی شوێن + ناوێکی سادە : ژێر چەپۆك
- ژمارە + ناو : دوو دڵ
- ئاوەڵناو + ە + ناو : پیرە مێرد
- ئاوەڵناو + ڕەگی کار : ڕەش پۆش

ئاوەڵناو + ووشەیەکی بێ واتا : گورج و گۆل

ئاوەڵناو + ئاوەڵناو : وورد وورد

## ج- پلەکانی ئاوەڵناو :

ئاوەڵناو دوو دیوی هەیە یەکەمیان ئەوەیە کە لە هەندێ ڕواڵەت لەگەڵ ناودا بەشدارە وەك : (ەکە)، ناسیاوی و ( ژماردنە ) ە . وە ڕووەکەی تری ئاوەڵناو تایبەتە بە سروشتی خۆی کە ئەمیش بەراورد کردنە لە دوو پلەدا، پلەی بەراورد کردنی ئاسایی و پلەی بەراورد کردنی بالآ .

پلەی یەکەم :

پلەی بەراورد کردنی ئاساییە، بە خستنەسەری ( تر ) دروست دەبێت وەك :

- زیرەك : زیرەك تر
- جوان : جوانتر

پلەی دووەم :

ئەمەش پلەی بەراورد کردنی بالآیە.مەبەست زیاد کردنی (ترین ) وەك :

- زیرەك : زیرەکترین
- جوان : جوانترین

## ٥- ئاوەڵکار Adverb :

### أ- پێناسەی :

ئەو بەشە ئاخاوتنەیە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بەکارەوە هەیە و وەسفی کات و شوێن و چۆنیەتی ڕوودان و ڕوونەدان ...ی دەردەخات (29) .

### ب- جۆرەکانی ئاوەڵکار :

ئاوەڵکار بە پێی بۆچوونی کرۆس (Cruse) سێ جۆرە وەك :

**١- ئاوەڵکاری لێکچواندن :**

جۆر و جێبەجێ بوونی کارێك نیشان دەدات کە دەشێ لە ڕێگای لێکچوواندنەوە دیاربکرێ وەك : (شێرانە، پیاوانە،.....هتد. وەك گوڵ، وەك سەگ..) کە تەزووی هەستی (نێنەر) دەرەبڕێ. وەك :

– شارەکە (وەك گوڵ) ڕازابووەوە.

**٢- ئاوەڵکاری چۆنیەتی :**

باس لە چۆنیەتی ڕودانی کارەکە دەکاتە وەك : (خێرا، باش، بەگورج،...هتد ) وەك :

– کچەکە (بەگورج) ی دەڕۆیشت .

– ئازاد بەخێرایی هات

**٣- ئاوەڵکاری هۆ و مەبەست :**

ئەم جۆرە وەك گرێ بەند کار دەکات، هەڵگری واتای کاریگەرییە، چونکە بۆچوونی لێکدانەوەی مرۆڤ و هۆی ڕوودانی کارەکە دەردەخات. وەك، ( لە بێ ئەقڵی، لە ترسا، بە ئەنقەست، بەخۆڕایی...) (30) وەك :

– منداڵەکە (لە ترسا) هەڵات .

– بە بۆچوونی من دڵتەنگی ئازاد بۆ کەمدەرامەتی دەگەڕێتەوە .

ئاوەڵکار وەك ئاوەڵناو کە رادەی دەچێتە سەر کاریگەریەکەی زیاتر دەبێت.

وەك :

– لەیلا (نەختێ) درەنگ هات .

لە زۆر باری تردا شوێن یا کات بەدیدی کرێت وەك :

لە زمانی کوردیدا دوو جۆری تری ئاوەڵکار هەن (31) کە بریتین لە :

**٤– ئاوەڵکاری شوێن :**

شوێنی رووداني کارەکە دەخاتە ڕوو، وەك : لەسەر، لەژێر، لە تەنیشت، لەماڵێ، لەسەر بان، بەردەم، نزیك، دوور.....هتد، هەندێك لەم ئاوەڵکارانە بۆ دیاریکردنی شوێن پێویستیان بە ئاماژەی دەست هەیە وەك : ئێرە، ئەوێ، لێرە ....هتد.

بەڕای من کارەکان بە تایبەتی رووداوەکان بە تواوەیی شوێنیان تێدایە وەك : هات، رۆیشت، چونکە لە شوێنێك ئەم کارەکراوە، بەڵام مۆڕفیمی بەتاڵی (٠) بۆ دادەنرێت .وەك :

– هات : رەگ + کات + کەس + شوێن

: ها + ت + ٠ + ٠

لە زمانی کوردیدا زۆر جار شوێن بە کات دەستنیشان دەکرێت وەك :

– پاش سعاتێکی تر دەگەینە لاتان

– ماڵیان دوو دەقیقە لێرە دوورە.

**٥– ئاوەڵکاری کاتی :**

کاتی رووداني کار دیاریدەکات وەك : رۆی هەینی، بەیانی، ئێوارە، نیوەڕۆ، بەهار، هەنووکە، دەست بە جێ، پار، مانگی داهاتوو،.....هتد کە رۆڵی ئەسپێکت Aspect دەبینن .

– بەیانی دێینەوە . ( خاڵی دەسپێکردنی کاتی رووداوە )

- دوو ڕۆژە پرۆەکە تەواوبووە ( کۆتایی کات نیشاندەدات ) .

سەرەڕای ئەم جۆرانە جۆری تریش دەبینرێن وەك :

**٦- ئاوەڵکاری جار :**

ژمارەی ڕووداوەکە دەخاتە ڕوو وەك :

- رزگار سێجار لە تاقیکردنەوە دەرنەچوو.

## ٦- ژمارە Nuber :

### أ- پێناسەی ژمارە :

ئەو کۆمەڵە وشەیە کە ئەرکی ڕووتی ناوی ژمارە یان چەندێتی یان کەرتێکی شتی دیاریکراو یان پلەی شتێك لە ڕیزدا دەگەیەنێ. کە خاوەنی خاسیەتی واتای ژمارەیە واتە بە تەنها یان ژمارەی شتێك .

### ب- جۆرەکانی ژمارە :

١- ژمارەی ڕیزکراو :

ئەو ژمارانە دەگرێتەوە کە ڕیزبەندی دەنوێنن و مۆرفیمی ( مین ) وەردەگرێت وەك : یەکەمین ، دووەمین ، سێیەمین ....هتد .

٢- ژمارەی ریشەیی :

ئەو ژمارانە دەگرێتەوە کە کەرتی تێدانییە و لە یەکەوە دەستپێدەکات تا کۆتایی وەك : ١، ٢، ٣، ٤ ، ٥، .....هتد .

٣- ژمارەی دابەشی :

کە ژمارەکە دووبارە دەکرێتەوە و پۆلێن دروست دەکات وەك : یەك یەك ، دوو دوو، سێ سێ .....هتد .

٤- ژمارەی کەرتی :

بۆ وردی ژماردن بەکاردێت وەك : سێ یەك، چوار یەك ، .....هتد (32).

### ٧- کار Verb:

#### أ- پێناسەی کار :

دەربڕینە بۆ روودانی کارێك لە کات و شوێنێکی تایبەتی دا.

#### ب- جۆرەکانی کار :

بەپێی لێکۆڵینەوەکان چوار جۆرە کار هەن (33 ) .

**١- کاری رووداو:**

ئەم جۆرە کارە جوولەی تێدایە وخۆکردە لە ژێرکاریگەری بکەردایە، تێپەڕن بکەرەکەی دەبێت (کارا) بێت و دەستی هەبێت لە روودانی کارەکە (34)، وەك (ئاگرتێ بەردان، دڵپیسکردن ،......) ئەم جۆرە کارانە بەیارمەتی کاری بە تاڵی یاریدەدری (کرد)، دروست دەبێت کە خۆی کارێکی ورووژێنەرە یان ئەو کارانەی لە بری بەکاردێن (گرت، خوارد، دا، برد...) وەك (سوێندخواردن، لەباوەش گرتن، رەنجی دا، پارەی برد....هتد ) .

**٢- کاری بارگەیەن :**

ئەم جۆرە کارە جوولەی تێدابێت یان نەبێت ئەوا خۆنەکردە و لەژێر دەسەڵاتی بکەر دا نیە و لە دوو کەرت پێکهاتووە بەزۆری ئاوەڵناو یان ئاوەڵکارە، ناوی بکەر، ناوی بەکار، چاوگ....) کەرتەکەی تری کارێکی داڕێژراوە بەتایبەتی کاری (بوون) وەك : ( لاوازبوون، بێ هێزبوون، نەخۆشکەوتن. زەردهەڵگەڕان سپی چوونەوە ...هتد) (35) .

**٣- کاری رەوشتی :**

ئەم جۆرە کارە پەیوەندی بەدەروون و هەست و پەی بردن و بیرکردنەوە هەیە و روودانی تێ ناکەوێ، رقلێبوونەوە، حەزلێبوون ....هتد. وەك :

- من رقم لە ریایی یە.
- ئەو حەزی لەقسەیە.

**٤- کاری دەروونی :**

ئەم جۆرە وەسفی رووداوێکی فیزیکی دەکات، کە جوولەی تێدایە و رووداوەکەش بەسەر کەسدا تێناپەڕێ وەك :

- منداڵەکە گریا .
- گورگەکە لوراندی .

## ج- کاتەکانی کار :

بۆ کات پێویستە جیاوازی لە نێوان (Time) (Tense) ( Aspect ) دا بکەین، تایم، کاتەکانی ( رابردوو، رانەبردوو) دەگرێتەوە، تێنس، کاتەکانی ( رابردوو، و رانەبردوو ) و ئێستا دەگرێتەوە نەك داهاتوو، ئەسپێکت پەیوەندی بە مۆدالیتی یەوە Modality هەیە، چونکە قسەکەر کار و ئاوەڵکار بەکاردێنێت بۆ دەربڕین دەربارەی کەسی لە دەوروبەرێکی دیاریکراو (36)، دوتیDowty پێی وایە لە رێگای ئەسپێکتەوە جیاوازی لە نێوان سەرەتای بار (Stat) و بەردەوامبوون لەگەڵ راپەڕاندنی کار(Act) دەکەین (37)، کۆك Cook پێی وایە کەتیگۆرییەکی واتاییە کاتی شاراوە لە سیستەمی کار دەردەخات (38) بەم پێیە ئەسپێکت وەسفی رووداو و ماوەی روودانی کات لە دەستپێکردن و بەردەوامبوون و تەوابوون دەگرێتەوە، ئایا تەواوبووە Perfective وەك :

- باوکم خەوتووە

- خانووەکە دوو ڕۆژە بەتاڵە .
- ڕۆژگار درەنگ هاتەوە

یان بەردەوامە Continuous وەك :

- وا دەشکێنم .

یان تەواو نەبووە Progressive وەك :

- ئێستا دەچم .
- بەیانی دەتبینمەوە
- کاتژمێرێك زیاترە چاوەڕێمە

لەم ڕستانەی سەرەوە مۆرفیمەکانی ( ە، ەوە، ووە ) ئەسپێکت دەبینن، سەرەڕای ئاوەڵکاتەکانی وەك: ( دوو ڕۆژە، درەنگ، وا، ئێستا، بەیانی، کاتژمێرێك زیاتر ) .

١- ڕابردوو :

أ- ڕابردووی سادە : (ڕەگ+کات) وەك : هات،چوو،شکا،مرد،بڕی .

ب- ڕابردووی بەردەوام : (ئێستا+ڕەگ+کات) وەك : دە+سوت+ا

ج- ڕابردووی تەواو : (ڕەگ+کات+مۆرفیمی ئاوەڵناو+ئێستا) وەك: ها+ت+و+ە

د- ڕابردووی دوور : (ڕەگ+کات+ڕەگی بوون+کاتی دوور) وەك: نووس+ت+ب+وو

هـ- ڕابردووی خۆزگەیی: (ڕەگ+کات+ڕەگی بوون+کات) وەك : خەو+ت+ب+ ا

٢- ئێستا :

(ڕەگی هەبوون+کاتی ئێستا) وەك: ( کورد + Ø + Ø + م )

(ناو + ڕەگی هەبوون + کاتی ئێستا + ڕاناو ) .

٣- کاتی داهاتوو :

( مۆرفیمی ئارایی + ڕەگ + کاتی داهاتوو ) وەك :

( ب + گەڕ + ێ ......جێناو ) ( بگەڕێم )

٤- کاتی رانەبردوو :

( ئێستا + رەگ + داهاتوو ) وەك : دە + چ + Ø....جێناو ) ( دەچم ) لە کەسی سێیەمی تاك راناو دەرناکەوێ بۆیە (ێ ) ی مۆرفیمی کاتی داهاتوو دەردەکەوێت .

## د- کار لە رووی هێزەوە :

١- تێپەڕ :

ئەم کارە بەسەر بکەر تێدەپەڕێت و پێویستی بە بەرکارە. ئەم کارانە دەبنە دوو جۆر، جۆری یەکەم خودی خۆیان تێپەڕن وەك : وەك: نووسی، خوارد ...هتد، جۆری دووەم بە ئامرازی ( اندن) دەکرێن بە تێپەڕ وەك : شکاند، سوتاند ....هتد. جگە لەو کارانەی کە کەرتی دووەمیان (کرد، گرت، ....هتد ) ە وەك : خانووکردن، دەستنوێژگرتن، .....هتد.

٢- تێنەپەڕ :

ئەم کارە تەنها پێویستی بە بکەر هەیە و بەرکاری ناوێت. وەك : هات، فڕی، شکا، گریا،....هتد . جگە لەو کارانەی کە کەرتی دووەمیان ( بووە) یان وەك :

- دارەکە زەرد بوو .

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم :

١- (نوری عەلی ئەمین:١٩٦٠: ٦٢)
٢- (لیژنەی زمان: ١٩٧٦ :١٠).
٣- (نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی : ١٩٨٢ : ١٠)
٤- (ك .ك . کوردۆییڤ : ١٩٨٢ :٦٧)
٥- (ئەورەحمانی حاجی مارف: ١٩٧٩: ٩٣)
٦- ( لیژنەیەك لەوەزازەتی پەروەردە: ٢٠٠٥ : ٣٨)
٧- (لیژنەی زمان: ١٩٧٦: ١١)
٨- ( لیژنەی زمان:١٩٧٦: ٦٢).
٩- ( لیژنەی زمان:١٩٧٦: ١٦).
١٠- (ئەورەحمان حاجی مارف: ١٩٧٩: ١٢٤ تا ١٣٧).
١١- ( لیژنەی زمان: ١٩٧٦: ١٦)
١٢- (ئەورەحمان حاجی مارف: ١٠٧ تا ١٣٣ )
١٣- ( لیژنەی زمان:١٩٧٦: ١٩)
١٤- (لیژنەی زمان: ١٩٧٦: ٢٠).
١٥- (لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە: ٢٠٠٥: ٢)
١٦- (لیژنەی زمان:١٩٧٦:٢٤)
١٧- (وریا عومە ئەمین:٢٠٠٤:٢٠٧).
١٨- (نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی:١٩٨٢:٢٠٤) .
١٩-(نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی:١٩٨٢:١٩٩).
٢٠-( نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی:١٩٨٢:٢٠٠)
٢١- (وریا عومەر ئەمین:١٩٨٤:٢٩)
٢٢- (نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی:١٩٨٢:٢٠٢)
٢٣- (نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی:١٩٨٢:٢٠٣)
٢٤- (نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی:١٩٨٢:٢٠٤) .
٢٥- (کوردستان موکریانی:١٩٨٦:٦٧)
26- (Leach:1974:18 )
٢٧- (محەمەد مەعروف فەتاح:١٩٩٠:٨٢)
28- (یوسف شریف سعید:١٩٩:١٢٥)

٢٩- (صادق بهاءالدين:١٩٨٧:٤٠٦)

٣٠- (Cruse:1991:273)

٣١- (نەسرین فەخری و كوردستان موكریانی:١٩٨٢:١٦٨)

٣٢- (نەسرین فەخری و كوردستان موكریانی: ١٩٨٢:١٧٦)

٣٣- محەمەد مەعروف فەتاح:١٩٨٩:٤٨)

٣٤- (محمد معروف فتاح:١٩٨٩:٤٨) .

٣٥- (محمد معروف فتاح:١٩٨٩:٥١) .

36- (Ba`albaki, op.cit:1990:312)

37- ( David Dowty:1972 :12)

38- (Walter Cook:1981:105)

## بەشی سێیەم : پۆلەفۆرم و پۆل گۆڕین

### ١- ڕێگاکانی دروستکردنی وشە Create of words:

وشە لە زماندا هەر بە سادەیی نامێنیتەوە، بەڵکو وشە سادەکە لە ڕێگای چەند کردەیەك گەشەو گۆڕانی بەسەردا دێت لە ڕووی فۆرمەوە بەم پێیەش کاریگەری دەبێت لەسەر گۆڕانی واتا، ڕێگاکانیش بریتین لە :

#### أ- دارشتن Establishment:

هەموو ئەو پێشگر و پاشگرانە دەگرێتەوە کە وشە دادەڕێژن وەك : نەمر ، نازدار ....هتد، هەندێ جار لە ڕێگای پارادایمی( Paradaigm ) وشە داڕێژەکان دروست دەکرێت کە هەمان بنجیان هەیە وەك : سەرە، سەرۆك، سەرەکی، سەرانە،.....هتد (١).

#### ب- داتاشین Derivation :

ئەم جۆرە ڕێبازە بۆ دروستکردنی وشە لە ڕێگای لێکدانەوە دەبێت، بەلام لە ئەنجامی لێکدان هەندێ دەنگ دەسوێ یان گۆڕانکاری بەسەردادێت وەك :

- ماست+ ئاو = ماستاو (دەنگی ئـ) سواوە.
- گا+ ئاسن = گاسن (دەنگی ئـ) سواوە.
- دەست+گیران= دەزگیران (دەنگی ت سواوە و دەنگی (س) گۆڕاوە بۆ (ز).

#### ج- لێکدان Installation :

لێکدان ڕێگایەکە بۆ دروستبوونی وشە و زاراوە کە لە ئەنجامی لێکدانی دوو وشە وشەیەکی نوێ دێتە کایەوە، ئەم لێکدانەش بە دوو شێوە ئەنجام دەدرێت

هەندێکیان بە مۆرفیمی لێکدەر ئەوانی تر بەبێ ئامرازی لێکدەر ئەنجام دەدرێت وەك: رەشمالْ ، گولْ و گیا،....هتد. زۆرجار بە کەرستەی خوازراو بەتایبەت زمانی عەرەبی کاری لێکدراو دروستدەکرێت وەك :

– ناو + کار = زەکاتی دا ، حەفلە دەکەن ، ئیفلاسیکرد.

– ئاوەڵناو+ کار = رازیدەکەن ، قانیع دەبم، مرەخەس دەبم (٢) .

## د- میتافۆر Metaphor :

لە زمانی کوردیدا دەتواندرێت دوو جۆرە واتا جیابکرێتەوە :

١– دروست:

بەو واتایە دەگوترێت، کە راستەوخۆ واتا فەرهەنگییەکەی دەدات.

٢– میتافۆر :

بەو واتایە دەگوترێت کە راستەخۆ واتاکە نیشان نادات، بەڵکو لەرێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ دیاریدەکەی واتا دەدات. بۆ نموونە وشەی (ئاگرنانەوە) دوو واتای هەیە (ئاگرتێبەردان) و (ئاژاوە نانەوە) واتای یەکەم واتایەکی درووستە و واتای دووەم واتایەکی خوازەیە.

## ە- زرەرێژ :

لە وشەی زمانی کوردیدا زۆر وشە بەرچاو دەکەون، کە لە رێگای زرەرێژەوە دوروست بووینە و لەوانەیە کەسێکی نەشارەزا بە وشەیەکی کوردی بێتە بەر چاو. زرەرێژ بریتییە لە وشانەی کە لەزمانی زمانی بێگانەوە چۆن دورست بووە و دارێژراوە بە هەمان شێوەش لە زمانی کوریدا دورست بووە و دارێژراوە. بۆ نموونە وشەیەکی وەك (Proanoun) و (جێناو) کە وەرگردراوێکی زمانی ئینگلیزییە و لە دوو مۆرفیمی جیا پێکهاتووە (Pro) واتە (جێ) و (Noun) واتە (ناو). هەروەها

وشــەیەکی وەك : (شــرق شــناس یــان شــرق خــاوەر) کــە وەرگێــردراوە بــۆ ( ڕۆژهەڵاتناس) ئەمیش لە زمانی فارسـی دا لـە دوو مـۆرفیم پێکهاتووە ( شـرق ، خاوەر ) واتە (ڕۆژهەڵات) و (شناس) واتە (ناس). بـەم جۆرە دەبینین ئـەم وشـە زرەڕێژانە لە کەرەسەی زمانی کوردیدا دورسـتکراون، بـەڵام شـێوەی پێکهاتنیـان تیشکدانەوەی وشەی بێگانەیان پێوە دیارە.

### و- وەرگێڕان Translation :

بێگومان بەشێکی وشەی هەر زمانێك لـە ڕێگـای وەرگێڕانـەوە دێتـە کایـەوە، لـە ڕێبازی وەرگێراندا واتای فەرهەنگی تاکە وشـەیەکی زمانـە بێگانەکـە وەردەگیرێـت وەك :

- اخراج : دەرهێنان
- تمثیل: نواندن.
- اجتماع: کۆبۆنەوە
- البنیە التحتیە: ژێخان.
- المظاهرة: خۆپیشاندان.

### ز- وەرگرتن Borrowing:

هەموو زمانەکانی جیهان وشـە دێتـە نـاو زمانەکەیانـەوە لـە ئـەنجامی هۆکـاری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایـەتی، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی سروشـت و تایبـەتی هـەر زمانێك جیایە لەویتر بۆیە ئـەو زمانـەی کـە وەریـدەگرێت دەیخاتـە ژێـر کاریگـەری فۆنۆلۆجی خۆی بۆ نموونە وشەی (قوتابی) لە (الکتتاب) ی عەرەبیەوە وەرگیراوە و بە سێ قۆناغ ڕۆیشتووە :

١- دەنگی (ك) گۆڕاوە بۆ (ق).

٢- لە دوو (ت) یەکیان فرێدراوە.

٣- واتای کتتابی عەرەبی لە (شاگرد) ی حوجرە بۆ فێرخوازی فێرگە و زانکۆ گۆڕاوە.

- حق : دەنگی (ح) گۆڕاوە بۆ (ھ).
- الکتاب : کتێب دەنگی (یّ) زیاد بووە.
- بحث : باس (ا) زیاد بووە و (ث) گۆڕاوە بۆ (س).
- مرؤة: مروەت (ء) سواوە (ة) گۆڕاوە بۆ (ت)
- ذلیل: زەلیل دەنگی (ذ) گۆڕاوە بۆ (ز) و لە بری فەتحە (ه) دانراوە.
- مقص : مقەس دەنگی (ص) گۆڕاوە بۆ (س) لە بری فەتحە (ه) دانراوە.
- وجدان : ویژدان (دەنگی ج بۆتە ژ) (٣) .

### ح- کرتاندن و لێکدانەوە :

بۆ نموونە داتاشینی وشەی (زانکۆ) دا کە پێکهاتووە لە کۆکردنەوەی ڕەگی (زانین) کە (زان) لەگەڵ لێکدانی (کۆکردنەوە) و کرتاندنی (کردنەوە) دروست بووە. هەروەها ئەم ڕێگایە لە وشەی (کۆ زمانەوانی) یش بەرچاو دەکەوێت .

### گ- ئەکرۆنیم :

ئەکرۆنیم بریتییە لە برگەی یەکەمی یان دەنگی یەکەمی دوو وشە یا زیاتر و خوێندنەوەیان بەیەکەوە یان وەك دەنگی پیتەکان بۆ نموونە (د.خ) بۆ دروودی خوای لەسەر بێت.(پ.ن) پێش زاین (٤) .

## ٢- پۆلە فۆرمەکان Form Classes و جیاکردنەوەیان :

هەر لەسەردەمی ئەفلاتون و ئەرستۆ وە هەوڵ دراوە بۆ پۆلینکردن و جیاکردنەوەی فۆمە زمانییەکان و پۆلینکردنیان، ئەوە بوو ئەفلاتوون ( ناو ) و

( کار ) ی لەیەك جیاکردەوە، جیاکردنەوەی وشەکان بۆ پۆل کارێکی ئاسان نییە، چونکە زۆر وشە هەن بەشداری زیاتر لە پۆلێك دەکەن، چەند بنەمایەك هەیە بۆ جیاکردنەوەی پۆلەکان کە بریتین لە :

## أ- نیشانە دەرکەوتووەکان :

ئەو نیشانانەن کە دەرکەوتوو و دیارن و پۆل دیاردەکەن، وەك : وەرگرتنی ( تر، ترین )، ئاوەڵناو دەگەیەنێت و وەرگرتنی (ان) ی کۆ ناو دەگەیەنێت و ....هتد . یان : داگرت (دا) مۆرفیمی دارشتنە و نەمر (نە) مۆرفیمی دارشتنە نەك (نەرێ ) ....هتد .

## ب- نیشانە شاراوەکان :

ئەو نیشانانەن کە پۆل دیاریدەکەن، بەڵام شاراوەن، ئەم نیشانانە دەبنە سێ جۆر :

١- سروشتی وشەکە خۆی :

وشەکە خۆیان لەە بنچینە دابەشبوون بۆ، ناو، ئاوەڵناو، کار ، ئاوەڵکارە، ....هتد. کە زۆر جار بەپێی واتا دیاریکراوە وەك : ئامانج ( ناوە) (پەنجەرە) و هیچ هۆکارێك نییە بۆ ناوە بۆ ئاوەڵناو نییە .

٢- بە پەیوەندی لەگەڵ وشەی تر :

وشەکانی هەرزمانێك تۆرێك پەیوەندی بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە لە هێڵی ئاسۆیی، وەك ئەوەی دوای ناو بێت ئاوەڵناوە،.....هتد .

٣- بە پاش و پێشکردن و شوێن گۆرین :

زۆر جار وشەکان بە شوێن گۆرین ئەرکی جیادەبینن وەك : ناو و ئاوەڵناو ، دیارخەر .....هتد. بۆ نموونە زۆر دەبێت لە پێش بێت ئاوەڵناو یان ناوی دوای ناو

دەبێتە دیارخەر وەك : وەك : كچی هەولێر ، لێرەدا هەولێر بۆتە دیارخەر و وەك ئاوەڵناو كاردەكات ....هتد .ئەوەی تا ئێستا رێكەوتنی تەوای لەسەربێت ئەوەیە فۆرمەكان دابەشكراون بۆ دوو پۆل، كراوە و داخراو .

### ٣- پۆلی كراوە و داخراو :

#### یەكەم : پۆلی كراوە :

ئەم پۆلە كراوەن و دەتوانن ئەندامی تر وەربگرن، بۆیەش رۆژانە وشەی نوێ دێتە مەیدان و واتادارن ئەمیش لە رێگای ناونان و بەكارهێنانەوە واتە رێگای لێكدان و دارشتن ....هتد .كە پێشتر باسمانكرد، بەلاّم لە هەموویان زیاتر لێكدان و دارشتنە كە ئەم فۆرمانە دەگرێتەوە وەك: ناو، ئاوەڵناو، .....هتد .

#### a – پۆلە فۆرمە سادەكان :

**أ- ناو :**

وەك : دار، بەرد، قوتابخانە، شاخ ......هتد.

**ب- ئاوەڵناو :**

وەك : زیرەك، ئازا، رەش، جوان، .....هتد.

**ج- ئاوەڵكار :**

هێواش، خێرا ،......هتد.

**د- كار :**

كاری سادە نییە، چونكە مۆرفیمی كات و شوێنی تێدایە .

## b- پۆلە فۆرمە لێکدراوەکان :

### أ- ناوی لێکدراو :

ناوەکان بەشێکیان بێ مۆرفیمی لێکدەر لێکدەدرێن وەك :

- دەستنوێژ
- رەشماڵ
- شاھەنگ
- مارماسی
- بەفراو

ھەندێکی تر بە ھەندێ ئامرازی لێکدەر لێکدەدرێت وەك: (ە،و،ەو،او ،ان، بە...هتد) وەك :

- گوڵەباخ
- بانەوبان
- رەنگاورەنگ.
- بەرانبەر (٥)
- لەرزوتا
- سەر بە گۆبەند (٦)

### ب- ئاوەڵناوی لێکدراو:

- گەردەن بلوور
- سەرگەرم
- سەرشکاو
- خۆشباوەر
- لێو بە بار.
- دوودڵ

**ج- ئاوڵكاری لێكدراو:**

ئاوەڵكاری لێكدراو پێكدێت لە دووبارەبوونەوەی فۆرمێك وەك: ناو ئاوەڵناو، ئاوەڵكار ....وەك :

- پۆل پۆل
- دوو دوو
- كەم كەم

هەندێ جا ئەم دووبارە بوونەوانە بە یارمەتی مۆرفیمی لێكدەری ( او) دەبێت وەك :

- پشتاوپشت.
- بانەوبان
- پربەدڵ (٧)

**د- كاری لێكدراو:**

بە یارمەتی ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵكار دروست دەبێت:

- دەست برین
- سەرشكاندن
- ڕێگاگرتن
- ماستاوكردن
- بڵندكردن.
- نەخۆشكەوتن.
- بەخێوكردن
- تێربوون.
- بڕیاردان (٨) .

## c- پۆله فۆرمه دارژاوەکان :

### أ- ناوی دارژاو :

که له شێوەی پێشگر و پاشگر بەرچاودەکەون و بەشداری لە دارشتنی وشەدا دەکەن وەك : هونەر+ مەند = هونەرمەند.

١- پێشگرەکان :

- نا+ پاك : ناپاك
- پێ ویست.
- رایەخ.
- بەرچنە،بەرکوت
- هاورێ،هاوژین

٢- پاشگرەکان :

وەك: (دار ـ بەند ـ وان ـ ەوان ـ گەر ـ ساز ـ چی ـ کەر ـ مەند ـ زار ـ ێن ـ نیە ـ ێنە ـ ەڵان ـ ار ـ ەر ـ یار ـ مان ـ ندە ـ گەرك ـ کە ـ ەمەنی ـ ەوە ـ ەوا).

- دار : بریندار
- وان : کاروان
- ەوان: ئاشەوان
- گەر: ئاسنگەر
- ساز: ددانساز
- چی: کەبابچی
- مەند: هونەمەند
- کەر: کارەکەر
- ێن: پشتێن
- ینە: دۆینە

- ێنە: زەردێنە
- ەوا: نانەوا
- زار : گوڵزار) (٩)

ئەم پاشگرانەش (ی ـ ەتی ـ ێتی ـ ایەتی) دەچنە سەر ناوی سادە و ناوی داڕێژراوی گوزارەیی پێکدێنن وە واتای ئەسبتراکت دەبەخشن، وەك :

- ی ، جوانی
- ەتی ، برایەتی
- یەتی ، دۆستایەتی

پاشگری ( گە ـ گا ـ خانە ـ ستان ـ دان ـ ەوان ) دەچنە سەر ناوی سادە و ناوی داڕێژراوی لێ پێکدێنن، وە بە شێوەیەکی گشتی شوێن و جێگە پیشان دەدەن :

- گە ، کارگە
- گا ، دادگا
- ستان ، کوردستان
- دان ، ئاگردان
- ەوار ، شێنەوار

پاشگری (لە ، ۆڵە ، ورلە ، وگە ، یلە ، ۆکە ، چە ، چکە ، ولکە ، یلکە ، ۆڵ ، ەل ، وو ، وك ، و) بەشێوەیەکی گشتی بۆ بچووك کرنەوە بەکاردێت لە دانەیەکیان هێندێکیان واتای بکەریش دەبەخشن وەك :

- لە : مێرولە
- ڵە : گۆزەڵە
- ۆڵە : کیژۆڵە
- ۆ : کوردۆ

ئەم پاشگرانەی لای خوارەوەش دەچنە سەر ئاوەڵناوی سادە و (ناوی داڕێژراو) ی لێ دروست دەکرێت و هەندێ لەو پاشگرانە ناوی داڕێژراوی واتایی دادەڕێژن وەك :

- ی : جوانی ، ئازادی
- ە : سەوزە
- ەتی : ئازایەتی (١٠)

## ب- ئاوەڵناوی داڕێژراو:

### ١- پێشگرەكان:

- بێ: بێهۆش
- بە: بەهێز
- نە: نەخۆش،نەزان
- نا: نارێك

### ٢- پاشگرەكان:

- یێ: جیهانی
- ن: ورگن
- ین: بەفرین
- وەر: بەختەوەر
- دار: ئاگادار
- یێ: كرمێ
- انە: منداڵانە
- ەكی: دەشتەكی
- انی: ژنانی
- ناك: غەمناك

- ە: هاوینە
- وور: رەنجوور
- اوی: شاخاوی
- دار: ناودار
- باز: فێڵباز
- انی: نەرمانی
- ۆ: پیسۆ
- ۆکە: پیسۆکە
- ەڵە: نەرمەڵە
- کەلە: سورکەڵە
- یلکە:سپیلکە
- ۆلکە: بەرزۆڵکە
- اك: رۆناك
- ۆك: لەرزۆك
- ەك: نووسەك
- ار: دیار
- ا: زانا
- وو: مردوو
- ین: بەرین (١١)

ج- ئاوەڵکاری داڕێژراو :

١- پێشگر:

- بێ: بێگومان
- بە: بەگوڕ

**٢- پاشگر:**

- یێ: شەویێ

- انە: ژیرانە

- ئاسایی: شێر ئاسایی

- ەکی: شەوەکی

**٥- کاری دارێژراو :**

کار لە زمانی کوردیدا بە دوو شێوە دادەڕێژرێت :

**١- پێشگر:**

- دا: دابەزین

- را: راگرتن

- هەڵ: هەڵچوون

- رۆ: رۆچوون.

- وەر: وەرگێران

- ڕێ: ڕێکخستن

- پێ: پێکەنین

- تێ: تێگەیشتن

- لێ: لێدان

**٢- پاشگر:**

- ەوە: کردنەوە

- اندن: سوتاندن (١٢)

## دووەم : پۆلە داخراوەكان :

پۆلـە داخراوەكـان ژمارەیـان دیـاریكراوە و زیـاد ناكرێـت، پـەیڕەوێك دروسـت دەكـەن و یـەكتر پێناسـە دەكـەن، بـە واتایـەكی تـر واتـای فەرهـەنگیان نییـە و واتاكـەی بـە بـەراوردكردن لەگـەڵ ئەنـدامانی تـر وەردەگـرین ، ئەمـەش نموونـەی هەندێك لەم كۆمەڵە داخراوانەیە :

### أ- مۆرفیمی ناساندن:

مۆرفیمی (ەكە) ئـەركی ناسـراوی دەبینێـت و چـەند ئـەلۆمۆرفێكی هەیـە وەك : ( كە،ەكە،یەكە ) (١٣). مۆرفیمی (ەكە) ی ناسیاوی زیاتر لە ئەلۆمۆرفێكی، هەیـە، چونكە لە هەندێ شوێن دا دەبێ بە ( یەكە یان و كە یـان ێكـە یـان ەك) وەك لـەم نموونانەی خوارەوەدا :

- پیاوەكە ـ ژنەكە
- چرایەكە ـ زاری هەولێر. واتا (ی) لە زاری هەولێر دا زیاد دەبێ
- خانوەكە ـ زاری سلێمانی. گۆرانی (ی بۆ و) لەزاری سلێمانی دا.
- قاپێكە ـ زاری سلێمانی
- چراكە ، تورەگەكە (١٤).

### ب- مۆرفیمەكانی كۆ :

١- ( ان) : نیشـانەیەكی سـەرەكیە بـۆ كۆكردنـەوەی نـاو، لـە نێـوان هـەموو نیشانەكانی تری كۆكردنەوەی دا ناو بە پلەی یەكەم دێت وەك : كچ + ان : كچان

٢- (ات) : وەك : باخ + ات: باخات

٣- (ە ها): وەك: دەرد + ە ها : دەردە ها (١٥) .

(ەها) لە دیالیکتی کرمانجی ناوەراستدا وەك مۆرفمێکی کۆ دەچێتە سەر ژمارەیەکی کەم لەناو، لە چەند فۆرمێیکدا بەرچاو دەکەوێت و مۆرکی کات لە خۆ دەگرێت. (١٦) وەك :

- سالْ + ە ها: سالّە ها

٤- (گەل) : مۆرفمێکی سەربەخۆیە، نیشانەی کۆ دەگەیەنێت، وەك :

- پیاو + گەل: پیاوگەل

٥- (ڕان) ئەم مورفیمە وەك مۆرفیمی کۆ لە دیالیکتی کرمانجی ناوەراستدا بەکاردێت .وەك: گا + ڕان: گاڕان .

٦- (ڕەوە) :

ئەم مۆرفیمە وەك مۆرفیمی کۆ بۆ ئاژەلْ و بالّندە بەکاردێت وەك :

- رەوە گورگ .

- رەوە بالّندیەك .

## ج- مۆرفیمەکانی رەگەز Gender :

لەم زارەدا تەنها لە بانگکردندا رەگەز رەنگدەداتەوە:

أ- (ە) بۆ نێرینە ( Masculine ) وەك: کورە، مامە

ب- (یّ) بۆ مێینە ( Feminine ) وەك: کچیّ، پوریّ...هتد.

## د- مۆرفیمەکانی کەس:

ئەو مۆرفیمانەن کە ئاماژە بۆ کەس دەکەن و دەبنە دووبەش (سەربەخۆ و لکاو) لە زاری ناوەراستدا سیّ دەستە راناوی لکاو هەن :

ستوونی (١) کە خاوەنییەتی نیشاندەدات، شت دەستەی ڕێکەوتن هەروەها لەگەڵ ڕابردووی تێپەڕیش دێت و ستوونی (٢) لەگەڵ ڕابردووی تێنەپەڕ دێت و ستوونی (٣) لەگەڵ ڕانەبردوودا دێت (١٧) .

| جودا | | | لکاو | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | کەس | | ١ | ٢ | ٣ |
| تاک | ١ | من | م | م | م |
| | ٢ | تۆ | ت | یت | یت |
| | ٣ | ئەو | ی | ـ | ات-ێت |
| کۆ | ١ | ئێمە | مان | ین | ین |
| | ٢ | ئێوە | تان | ن | ن |
| | ٣ | ئەوان | یان | ن | ن |

## هـ- مۆرفیمەکانی کات:

مۆرفیمەکانی کات بریتین لە :

**أ- ڕابردوو :** ( ا – ت – د – و – ی ) وەک: سوتا، کەوت، مرد، چو، فڕی وەک :

- ڕابردووی تەواو: من چوم
- ڕابردووی نزیک: من چومە.
- ڕابردووی بەردەوام: من دەچوم
- ڕابردووی دوور: من چووبووم.
- ڕابردووی خۆزگەیی: من چووبام

**ب- ئێستا:** (ە) وەک :

- نووسیوم (ە)
- مامۆستامە (ە)

**ج- داهاتوو:** (یَ) وەک :

- دەسوت + (یَ)

- دەچێ + (ێ)

## و- مۆرفیمەکانی نیشانە:

ئەو مۆرفیمانەن کە ئاماژە بۆ شت دەکەن و لەگەڵ ناودا دەردەکەون، مەکەنزی و مەکارۆس بە کۆنفێکس ( جووتگر ) دی دادەنێن، و جۆرە دەبن بە دوویەشەوە :

| نیشانە | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| نزیك | ئەم....ە | ئەم......انە |
| دوور | ئەو....ە | ئەو......انە |

ناو و هەموو ئەوانەی لەگەڵی دا دەردەکەون دەکەونە نێوان ئەم دوو بەشانەوە (نیشانە) و (ەکە) و (ێك) هەرگیز لەگەڵ یەکتر دەرناکەون . گرێ لە کوردی دا یەك جار ئامرازی کۆی دەچێتە سەر. لەگەڵ مۆرفیمی نیشانەدا ناو و ئاوەڵناوەکان بەهۆی ئامرازی بەستن (ە) لێکدەدرێن وەك لەگەڵ (ەکە) دا، چونکە مۆرفیمی نیشانەش چەمکی ناساندن دەگەیەنێت .

## ز- مۆرفیمەکانی نەناسیاوی:

مۆرفیمەکانی (ێ،ێك) کە دەچێتە سەر ناوێك ئەوا چەمکی نەناسیاوی دەگەیەنێت وەك :

- وڵات + ێك = وڵاتێك.

- کوڕ + ێ = کوڕێ

## ح- مۆرفیمەکانی نەرێ:

مۆرفیمەکانی نەرێ بریتین لە (نە،نا،مە،نی) کە بە پێی کات و جۆری فرمانەکە دەگۆڕێت وەك :

١- ( نە) : لە فرمانی رابردوو: نەهات .

٢- ( نە) : لە خۆزگەیی و مەرجی ئێستا: نەچم ، نەڕۆین .

٣- ( نا) : لە رەگی ئێستا: ناچین، ناڕۆین .

٤- (مە) : لە داخوازی: مەکەن،مەشۆ.

٥- (نی- نا) لە کاری بوونی کاتی ئێستا: زیرەك نییە،نازانین (١٨) .

## گ- مۆرفیمەکانی دووپاتکردنەوە:

مۆرفیمی (ەوە) ئەرکی دووبارەبوونەوەی رووداوی کارەکە دەگرێتە ئەستۆ، کە مۆرفیمی (ە) ناوبڕە و مۆرفیمی ( و) ئەرکی رابردوویی و مۆرفیمی (ە) ئەرکی نزیکی دەبینێت وەك :

- هاتمەوە .

- دەتبینمەوە .

## ی- مۆرفیمی نادیاری :

مۆرفیمی ( ڕ ) نادیاری لە رستەی بکەر نادیار دا بەکاردێت، کە بریتییە لە مۆرفیمی ( ڕ ) و دەخرێتە سەر فرمانەکە دواتر مۆرفیمی کات دەخرێتە سەر فرمانەکە (ا) بۆ رابردوو و (ێ) بۆ رانەبردوو و بە پێی کەس و ژمارە بەرکارە راناوی لکاو وەردەگرێت وەك :

- ئێمە ئازاد دەناسین . دەبێتە : ئازاد دەناسرێت .

- من ئێوەم دیتبوو. دەبێتە : ئێوە بینرابوون (19) .

## ك- مۆرفیمی چاوگ :

(ن) ی چاوگ دەگرێتەوە وەك :

- هاتن

- چوون
- بردن
- بڕین
- شکان

### ٣- پۆل گۆڕین :

لەناو پۆلە کراوەکاندا جۆرە ئازادییەك هەیە بۆ پـۆل گـۆڕین ئـەویش لـە ڕێگـای بـەکارهێنان و ناونـان یـا لـە ڕێگـای دارشـتن و لێکـدان، ئـەم دیاریدەیـەش پێویستییەکی زمانە :

#### أ- بەکارهێنان :

بەکارهێنان و ناونان هۆکارێکە بـۆ پۆلگـۆڕین بـۆ نموونـە : ( جـوان) (ئاوەڵنـاوە) بەڵام لە ڕستەی :

- جوان قوتابییەکی زیرەکە. ( جوان ) بۆتە ناو .
- شیلان وانەکانی جوان ئامادەدەکات . ( جوان ) بۆتە ئاوەڵکار .

دیسان هەندێ وشەی تـری وەك ( بـاش، تونـد ) ئاوەڵنـاون، بـەڵام لـەم ڕسـتانەی خوارەوە بوونەتە (ئاوەڵکار) :

- فەرهاد باش یاری دەکات .
- یارا دەرگاکەی توونـد داخست .

دەتواندرێت بەمانە بگوترێ ( هاوبێژ ) .

#### ب- بە لێکدان :

بە لێکدانی پۆلەکان پۆلی تر دروست دەکرێت وەك :

### أ- پۆلگۆڕین لە (ناو) بۆ (ئاوەڵناو) :

ناو + ناو : ئاوەڵناو

- گەردەن + بلوور : گەردەن بلوور
- لێو + بە + بار : لێوبەبار .
- ژمارە + ناو : ئاوەڵناو
- دوو + دڵ : دوو دڵ
- پشت + او + پشت : پشتاوپشت.
- بان +ەو + بان : بانەوبان

### ب- پۆلگۆڕین لە (ناو) بۆ (ئاوەڵکار) :

ناو + ناو : ئاوەڵکار

- پۆل + پۆل : پۆل پۆل

### ج- پۆلگۆڕین لە ژمارە بۆ ئاوەڵکار :

ژمارە + ژمارە : ئاوەڵکار

- دوو + دوو : دوو دوو

### د- پۆلگۆڕین لە رادە بۆ ئاوەڵکار :

رادە + رادە : ئاوەڵکار

- کەم + کەم : کەم کەم
- زۆر + زۆر : زۆر زۆر

**ج- بە دارشتن :**

لە ڕێگای پێشگر و پاشگر وشەی نوێ دادەڕژرێت واتە وشەیەکی نوێ ی پۆل جیاواز دروست دەبێت :

**أ- پۆل گۆڕین لە (ناو) بۆ (ئاوەڵناو):**

١- پێشگر + ناو : ئاوەڵناو

- بێ + هۆش : بێهۆش
- بە + هێز : بەهێز
- نە+ نەخۆش : نەزان

٢- ناو + پاشگر : ئاوەڵناو

- گولان + ی : جیهانی
- ورگ + ن: ورگن.
- بەفر + ین: بەفرین
- بەخت + وەر: بەختەوەر.
- کرم + ێ : کرمێ
- منداڵ + انە: منداڵانە
- دەشت + ەکی : دەشتەکی
- ژن + انی : ژنانی
- غەم + ناک : غەمناک
- هاوین +ە : هاوینە
- شاخ + اوی : شاخاوی
- ناز + دار : نازدار
- فێڵ + باز : فێڵباز

- سوود + مەند : سوودمەند
- غەم + گین : غەمگین
- درۆ + زن : درۆزن

**ب- پۆلگۆڕین لە ( کار) بۆ (ئاوەڵناو ) :**

کار + پاشگر : ئاوەڵناو :

- مرد + وو: مردوو

**ج- پۆلگۆڕین لە (ئاوەڵناو) بۆ (ئاوەڵکار) :**

ئاوەڵناو + پاشگر : ئاوەڵکار

- ژیر + انە: ژیرانە

**د- پۆلگۆڕین لە (ناو) بۆ (ئاوەڵکار) :**

١- پێشگر + ناو : ئاوەڵکار

- بێ + گومان : بێگومان
- بە + گوڕ : بەگوڕ

٢- ناو + پاشگر : ئاوەڵکار

- بەهار+ ێ : بەهارێ
- پیاو + انە : پیاوانە
- شێر + ئاسا : شێر ئاسا
- شەو + ەکی : شەوەکی
- پایز + ان : پایزان

## هـ- گۆڕینی (کار) بۆ ( ناو ) :

١- پێشگر + ڕەگی کار : ناو

- پێ + ویست : پێویست
- ڕا + یەخ : ڕایەخ
- بەر + کوت : بەرکوت

٢- ڕەگی کار + پاشگر : ناو

- وت + ار : وتار
- پرس + یار : پرسیار
- نووس+ ەر : نووسەر
- دوور + مان : دوورمان
- فڕ + ۆکە : فڕۆکە
- لەوەڕ + گە : لەوەڕگە
- کوت + ەك : کوتەك
- خۆر + اك : خۆراك
- کرد + ەوە : کردەوە
- خوێن + ەوار : خوێنەوار
- کوش + ندە : کوشندە
- سووت + ەمەنی : سووتەمەنی
- بار + ان : باران
- گەڕ + یدە : گەریدە

## و- پۆلگۆڕین لە (ئاوەڵکار) بۆ (ناو) :

ئاوەڵکار + پاشگر : ناو

- پێش + ین : پێشین
- بن + ار : بنار
- پێش + ەوا : پێشەوا

## ز- پۆلگۆڕین لە (ئاوەڵناو) بۆ (ناو) :

ئاوەڵناو + پاشگر : ناو

- بەرز + ێتی : بەرزێتی
- کەم + ایەتی : کەمایەتی
- نەرم + ەڵان : نەرمەڵان
- زەرد + ێنە : زەردێنە
- پیس + کە : پیسکە
- ئەستوور + ک : ئەستوورک
- رەق + ان : رەقان
- پاک + انە : پاکانە
- رووت + ەن : رووتەن
- بەرز + ەک : بەرزەک
- نەرم + ین : نەرمین
- دڕ + ندە : درندە
- سارد + ەمەنی : ساردەمەنی
- رووت + ەڵە : رووتەڵە
- ئازاد + ی : ئازادی
- سەوز + ە : سەوزە

ئەم پۆلگۆڕینە بە پێی پێویستی زمان دەبێت، دەبین زیاتر ناو دەگۆڕدرێت بۆ ئاوەڵناو، ئەمەش راستی بۆچوونەکەی مامۆستای خوالێخۆشبوو (پ.د. محەمەد مەعروف ) دەسەلمێنێت کە زمانی کوردی ئاوەڵناوی کەمە (٢٠).

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم :

١- (صباح رەشید قادر:٢٠٠٩:٣٥).

٢- (محەمەد مەعروف فەتاح :١٩٩٠:١٤٣).

٣- (کامل حەسەن بەصیر: ١٩٧٩:٤٤ تا ٤٦)

٤- (محەمەد مەعروف فەتاح:١٩٩٠:١٢٢).

٥- (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧:٤١)

٦- (کامل حەسەن بەصیر: ١٩٧٩:٦٣).

٧- (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧:٩٥)

٨- (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧:٩٤)

٩- (نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی: ١٩٨٧ :١٣-١٤)

١٠- (نەسرین فەخری و کوردستان موکریانی :٢٠٠٠ :٣٢)

١١- (ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧: ٦٥ تا ٧٢)

١٢-(ئەورەحمانی حاجی مارف:١٩٨٧:٨١)

١٣- (ئەورەحمان حاجی مارف:١٩٨٧ :٢٤)

١٤- (مەحەمەد مەعروف فەتاح:١٩٩٠: ٧١-٧٢)

١٥- (ئەورەحمانی حاجی مارف: ١٩٧٩: ١٤٧- ١٥٢)

١٦- (هیدایەت عەبدولا محەمەد: ٢٠٠٢: ١٠٠).

١٧- (وریا عومە ئەمین:٢٠٠٤:٢٠٧).

١٨- (وریا عومەر ئەمین، ئەرێ :-:-)

١٩- (وریا عومەر ئەمین:٢٠٠٤:١٧٤)

٢٠- ( بڕوانە محەمەد مەعروف فەتاح:هەندێ تێبینی دەربارەی ئاوەڵناو، رۆشنبیری نوێ، ژ:١٢٥ ساڵی:١٩٩٠ لاپەرە : ٨٠)

## بەشی چوارەم : وشەسازی فەرهەنگی Lexical Morphology

لــەم مۆرفۆلۆجییــەدا وشــەی فەرهــەنگی (Lexicon) بــە دانــەی شــیکردنەوەی وشەسازی دەژمێردرێت، یاساکانی فۆنۆلۆجی وشەسازی تەواوکەری یەکترین و بە دوای یەکتردا دێن .

### ١- یاسای لێکسیکییەکان Lexical rules:

یاسای لێکسیکی لە چوارچێوەی وشە کاردەکات، یاسا مۆرفۆلۆجییــەکان پــێش یاسا فۆنۆلۆجییەکان دەکەون بە یەکەوە کاردەکەن و یەکتری تەواو دەکەن .

#### a- پۆلە گیرەکەکان :

#### أ- گیرەکە بەهێزەکان :

ئەو گیرەکانەن کە کار دەکەنە سەر قەد یان رەگ یان بنج شێوە فۆنەتیکییەکەی دەگۆرێت یان هێزی لێوەردەگرن، کە دوو دەستەن :

**دەستەی یەکەم :**

پاشگرە دارشتنەکان، وەك ئەم گیرەکانەی خوارەوە :

- ساز : دانساز
- وان : مەلەوان
- دان : گوڵدان
- ە : فرۆکە
- ۆکە : شەکرۆکە
- ی : گەرمی
- ەر : نوسەر

- ایەتی : برایەتی

**دەستەی دووەم :**

پاشگرە ڕێزمانییەکان وەك ئەم گیرەکانەی خوارەوە :

- ن : ڕۆیشتن
- وو : هاتوو
- تر، ترین : باشترین .
- ەکە: پیاوەکە
- ان : پیاوان
- گەل : مێ گەل
- ا : کێلاّ
- ت : نووسی
- و : گەیشت
- ی : دروو
- د : برد
- بوو : کێلاّبوو
- نا : ناخۆم
- دە : دەخۆم

## ب- گیرەکە بێهێزەکان

ئـەو گیرەکانــە دەگرێتــەوە کــە هێــز ڕاناکێشــن، وەك : پیاوێــك، نیشــانە نەناسیاوییەکە هێز ڕاناکێشێت، وەك زوربەی ئامرازە بەندەکانی :

- لە.....ەوە : لە کەرکوکە وە
- بە .....دا : بە دهۆك دا

جێنـاوە لکاوەکـان لـە نێـوان بـەهێز و بێهێـز دایـە، واتـە هەنـدێکجار بـەهێز و

هەندێکجاری تر بێ هێز وەك هەموو ئەو نووسەکانەی کە بە کاری رابردووەوە دەلکێن :

- نووسیم
- دەم نووسی
- نووسیبووم
- بم نووسیبا

لە رانەبردووی ئینشائیدا هێز وەردەگرێت وەك :

- دەڕۆم
- دەڕوات

## b- دارشتن لە وشەسازی فەرهەنگی :

لە لێکداندا پاشگرە بەهێزەکان دەبنە پۆلی یەکەم و پاشگرە بێهێزەکان دەبنە پۆلی دووەم بەم شێوەیەی خوارەوە :

( رەگ + پاشگری بەهێز + پاشگری بێهێز ) وەك : دان + ساز + ێك : دانسازێك

ئەگەر لە کاتی لێکدان پاشگری هێزدار هەبوون ئەوا هێزەکە دەچێتە سەر دوا پاشگر وەك :

- فرۆك + ە+ وان
- هۆش + مەند + ی

لە زمانی کوردیدا بەهێزترین پاشگر ئەوەی دواوەیە، ئەو برگەی کە هێز وەردەگرێت درێژدەکرێتەوە و ئەوی تر بە کورتی دەخوێندرێتەوە، لە وەرگرتنی هێزدا دوو هۆکار هەیە :

١- جۆری پاشگرەکە
٢- شوێنی پاشگرەکە

– دە + خۆ + م + ەوە

بەهێز + ڕەگ + بێ هێز + بێ هێز

– کتێب + ەکە + ان + م :

بەهێز + بەهێز + بێهێز

– دە+ یان + بر + د + ەوە

بەهێز + بەهێز + ڕەگ + بەهێز + بێ هێز .

## ٢- یاسا فۆنۆلۆجییەکان :

ئاشکرایە کە فۆنیمەکان مۆرف پێکدێنن، لەکاتی لێکدانی ئەم مۆرفانە دیاریدەی فۆنۆلۆجی جیاجیا ڕوودەدن وەك :

### یەکەم : گۆڕانە فۆنۆلۆجییەکان

#### أ- دەرکەوتنی دەنگ :

١– دەرکەوتنی (ی):

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (ا - ۆ - ێ - ی) بێت ئەوە لە نێوان ناو و ناونیشانەکەدا (ی) نیمچە بزوێن پەیدا دەبێ وەك : برا + ان = برایان. بەهەمان شێوەش ئەگەر (ێك) نەناسیاوی بچێتە سەر ناوێك ئەوا (یٚ) دەردەکەوێ، وەك : پادشا + ی + ێك = پادشایێك .

٢– دەرکەوتنی (و):

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێن (وو) بێت ئەوا لە نێوان ناوەکە و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (و) دێتە کایەوە، هەروەها بزوێنی (وو) ی کۆتایی ووشەکە کەسێك لە باری ئاسایی کورت تر دەوترێ وەك :

– بەڕوو + ان = بەڕوان.

ئەگەر ناوێك كۆتایی بە بزوێنی (وو) بێت ئەوا لە نێوان ناوەکە و نیشانەکەدا (و) ی نیمچە بزوێن پەیدادەبێ وە (وو) کەمێك کورتتر دەوترێت وەك :

ئارەزوو + ەکە = ئارەزووەکە .

٣- دەرکەوتنی (ت)

لەم بارانەدا دەردەکەوێت :

أ- فرمانی رابردووی ئێستای تەواو ئەگەر ئامرازی پەیوەندی رستەکە(ە) بێت ئەوا (ت) ی گونجان دەکەوێتە نێوانیان وەك :

- ناردوومە + ت + ە : هەولێر = ناردوومەتە هەولێر

ب- لەو فرمانانەی کە مۆرفیمی دوپاتی (ەوە) ی بەدواوە دێت دەشێت (ت) ی گونجاندن بێتە نێوانیان وەك : هێناومە+ت+ەوە = هێناومەتەوە، بەڵام بە دەرنەکەوتنی راناوی کەسی لکاو لەگەڵ فرمانی تێپەردا ئەوانەی کە رەگی رابردوویان بە نەبزوێن کۆتایهاتووە ئەو کاتە بزوێنی (وو) دەگۆڕێت بۆ (ۆ) وەك :

- ئازادم ناردۆتە هەولێر .

٤- دەرکەوتنی (ر):

لە زاری ناوەڕاست ئەگەر کۆتایی فرمانی داخوازی بە پیتی ( ە+ ۆ + ێ ) هات و مۆرفیمی دوپاتی (ەوە) ی بەدواوە هات ئەوا (ر) دەردەکەوێت وەك :

- بکە+ر+ەوە = بکەرەوە .

## ب- توانەوەی دەنگ :

١- توانەوەی (ە)

بردن (دە+بە+ات) = دەبات (١) .

ئەگەر ناوێك کۆتایی بزوێنی (ە) بێت ئەوکاتە (ە) ی کۆتایی ناوەکە دەتوێتەوە وەك: بەرە + ان = بەران (٢) .

لە کاتی زیادکردنی (ەکە) لەسەر ناو ئەوا بەم شێوەیە گۆڕانکاری لەسەر ناوەکە ڕوودەدات، ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی ( ا - ۆ - ێ) بێت ئەوا بەم شێوەیە سەرەتای (ەکە) دەتوێتەوە، یاخود لە نێوان ناو و نیشانەکەدا (ی) نیمچە بزوێن پەیدا دەبێ وەك :

– هەوا + ەکە = هەوا کە

ئەگەر ناوێك بە (ە) ی بزوێن کۆتایی بێت ئەو کاتە یەکێك لەو دوو بزوێنە (ە) ی سەرەتایی یاخود کۆتایی وشەکە دەتوێتەوە و یەکێکیان دەمێنێ وەك :

– شوشە + ەکە = شوشەکە

لە کاتی زیاد کردنی (ەکە) بۆ ناوی کۆ، لەم بارەدا (ا) و (ە) دەکەونە پاڵ یەك و (ە) دەتوێتەوە وەك :

– شەهید + ەکە + ان = شەهیدەکان.

٢– توانەوەی (ی):

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێن (ی) بێت، ئەوا هەرچەندە بەزۆری لەنێوان نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (ی) سەرهەڵ ئەدات، بەڵام حالەتی توانەوەی (ی) یاخود بوونی بە (ێ) دەبینرێ، وەك :

شایی + ەکە = شایی یەکە

(ی) راناوی لکاویش بەهەمان شێوە کاتێك دەچێتە سەرکارێك کە کۆتاییەکەی بە (ی) هاتبێت، ئەوا (ی) راناو لەناو (ی) رەگەکە دەتوێتەوە وەك :

– کڕی + ی = کڕی (٣) .

٣– توانەوەی (ێ) ی (ێت) :

لەم لێکدانە یەکێ لە (ێ) یەکە دەتوێتەوە لادەچێت وەك :

دەشکێ + ێت = دەشکێت. و ئەشێ (ت) لابردرێ و بگوترێت : دەشکێ (٤) .

٤– توانەوەی ( ت ، ك ، ن ، د ، ب )

– دەست + کەوت : دەسکەوت.

- کاك عەلی : کا عەلی
- حەوت : حەو (زاری سلێمانی).
- پاك + کردن : پاکردن
- بەڵێن + نامە: بەڵێنامە (٥) .
- لێمدا: لێما
- مەحمود: مەحمو (شێوە زاری سلێمانی) .
- دەوڵەمەند: دەوڵەمەن (٦) .
- رابکە: راکە
- وەربگرە: وەرگرە.
- منداڵ: مناڵ .

## ج- دەنگ گۆڕکێ :

١- گۆڕانی (ی بۆ ێ):

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێن (ی) بێت، ئەوا (ی) دەگۆڕێت بۆ (ێ) وەك :

- نانچی+ەکە: نانچێکە

لێرەدا (ی) دەگۆڕێت بۆ (ێ)

٢- گۆڕانی ( و بۆ ێ ) :

لێرەدا ( و ) بۆ ( ێ ) لەزاری سلێمانی دا وەك :

- خانی : خانۆکە

٣- گۆڕانی (ێ بۆ ە ):

لە کاتی چوونەسەری (ێك) ی نە ناسیاوی بۆ ئەو ناوانەی کە کۆتاییان بە بزوێن هاتووە ئەوا (ێ) دەگۆڕێت بۆ (ە) و (ی) ی نەبزوێنیش بۆ گونجاندن دێتە نێوانیان وەك :

(ا) : دەریا + ێك = دەریایەك

(ە) : پەپولە + ێك = پەپولەیەك) (٧)

٤- گۆڕینی ( ۆ بۆ و ) :

- دە + خۆ + ات = دەخوات

٥- گۆڕان لە (ی بزوێن بۆ ی نەبزوێن).

لەکاتی چوونەسەری راناوی لکاوی (ی) بۆسەر فرمانێك کە کۆتاییەکەی بە (بزوێن) هاتبێت ئەوا (ی) دەگۆڕێت بۆ (نەبزوێن) وەك :

- هێنا+ی = هێنای (٨)

## دووەم : دابەشبوونی هێز لە وشەدا :

زیادە وزەیەکی دەنگییە لە پڕ لەسەر یەکێ لە برگەکانی وشە سەرهەڵدەدات، واتە هێز سەر بە ئاستی مۆرفۆلۆجییە و دەوری لە چوارچێوەی ئەم ئاستە دەرناچێت، (٩) ، هێز بە شێوەیەکی پتەو بەندە بە وشەوە و بریتی یە لە خاسیەتی هێزی وشە بەدەرخستنی یەکێك لە برگەکان و دەستەڵاتی بەسەر گشت ئەوانی دی بێ هێزدا دەوترێ (١٠) بەپێ ژمارەی برگەکان دەتوانرێ وشەی زمانی کوردی دابەش بکەین بۆ :

### أ- هێز لە وشەی سادە دا :

لە زمانی کوریدا وشەی سادە بە زۆری ئەو وشەیەك مۆرفیمانە دەگرێتەوە، کە سەر بە گرێی ناوین یا دەتوانین ئەرکی ناو ببین، وەك ( ناو، ڕاناو، ئاوەڵناو .....هتد. هێز لە وشەی سادەدا یەك برگەیی بێ یان پتر ، لەسەر دوا برگە دەبێت، واتە لەسەر بزوێنی برگەکەیە و ئەگەر بزوێنەکە بە ئاشکرا دەرنەکەوتبێ ، لەسەر بزرۆکەی نێوان دوو فۆنێمە نەبزوینەکەیە وەك :

/ ba / با     / da / na / دانا     / na / sik / ناسك

/ cv / civ /            / cv / cv /            / cv /

لە وشەی سادەی دوو برگەیی ئەگەر برگەی یەکەمیان بزوێندار و ( برگەی فۆنۆلۆجی ) بێ و برگەی دووەمیان بزۆکەدار ( برگەی فۆنەتیکی) بێ، ئەوا هێز دەکەوێتە سەر برگەی یەکەم وەك :

جەژن /ce /jin/

/cv̲ /cvc/

لە وشە سادە سێ برگەییەکانیش هێزی سەرەکی دەکەوێتە سەر بزوێنی برگەی کۆتایی وەك :

/ ze /re /van /

/cv /cv / cvc /

بە هەمان شێوە لە ووشە سادەی چوار برگەییەکانیش هێزی سەرەکی دەکەوێتە سەر بزوێنی برگەی کۆتایی وەك :

/swa /re /tu/ ke /

/ cv / cv/cv/ cv̲ /

بەهۆی پۆلێن کردنی ووشە راستەوخۆ رشتەی هێز (Accentual System) لە زمانی کوردیدا شەق دەکات، دەتوانین رێسایەکی بنچینەیی بۆ دانانی هێز لەسەر وشە دابنێین کە هێز دەکەوتە سەر دوا برگەی ووشە، بەبێ ئەوەی گوێ بدرێتە ژمارەی ئەو برگانەی کە وشە هەیەتی .

## ب- هێزی لە وشەی دارێژراو دا :

لە ووشە دارێژراوەکان دا جێگای هێزی سەرەکی دەگۆرێت و ئەمەش دەوەستێتە سەر سروشتی ئەو گیرەکانەی (Affix) کە پێیەوە دەلکێت، واتە

ئەوان هێز وەرگرن یاخود یان نا ، جگە لەمە دەوەستێتە سەر ڕیزبوونی رستەی (هێڵی Linear ) زنجیرەی قسە، ئەگەر لەوێدا چەند گیرەکێکی هێز وەرگر هەبێت ئەوا گیرەکەکە هێز وەردەگرێت، بەڵام ئەگەر گیرەکەکە بێ هێز بێت، ئەوا هێزی سەرەکی لەسەر دوا برگە یا رەگی وشە (Root) دەمێنێتیەوە وەك :

/ Bşa / tir / باشتر

/ cvc / cy̲c /

دەتوانرێ وشەی دارێژراو دابەشی دوو بەش بکرێ، وشەکانی کۆمەڵەی ناوی و کۆمەڵەی کاری. هەرچی کۆمەڵەی ناویە، بەشێوەیەکی گشتی وەك وشەی سادە رەفتار دەکا و بەردەوام هێز لەسەر دوا برگەیە، تەنیا لەو بارەدا نەبێ، کە برگەی کۆتایی بزۆکەدار (برگەی فۆنەتێکی ) بێ و نزیکترین برگەی پێش کۆتایی بزۆێندار (برگەی فۆنۆلۆجی) بێ، لەم بارەدا هێز دەکەوێتە سەر برگە فۆنۆلۆجیە بزوێندارەکە، وشەی یەك برگەی دارێژراو لە کۆمەڵەی ناویدا کەمە، چونکە هەرچۆنێك بێ، وشە تەوەرەییە برگەیەکە و ئەو مۆرفیمە بەندە گیرەکەی پێیەوە دەلکێ دەبێتە برگەیێکی تر ، بەڵام لە کۆمەڵەی کاریدا بەدیدەکەرێ .

### ج- هێز لە ووشەی لێکدراودا :

لە ووشەی لێکدراودا کۆمەڵەی ناویدا، بەشێوەیەکی گشتی هەمان شێوەی ووشەی سادە ودارێژراو، هێز دەکەوێتە سەر دوا برگەی وشە وەك :

/jo/ le/mé /rig /

/cv/ cv/ cv/cy̲c/

جێی سەرنجە، لە کۆمەڵەی کاریدا، ووشەی سادە لە روانگەی مۆرفیمەوە لە ئارادانیە یان دارێژراوە یان لێکدراوە، چونکە بەلای کەمەوە کاری گەردانکراو لە دیالێکتی ناوەراستدا سێ مۆرفیمی تیادایە، کە رەگی کار و مۆرفیمی کات و

مۆرفیمی کەسە .لە لایەنی مۆرفۆلۆژی یەوە دەتوانین سێ جۆرە ووشەی لێکدراو، جیابکەینەوە :

– لێکدراوی کراوە کە پارچەکانی بەبزوینی/ە/ پێك بەستراوەتەوە وەك :

( کورەمەلا، تەرە پیاز، جووتە سوار، بێچووە پشیلە، بوومە لەرزە )

– ئەو ووشە لێکدراوانەی بە ( و ) پێکەوە بەستراون وەك :

( دەنگ و باس، کار و بار، بەژن و بالاَ ، تەنگ و چەڵەمە )

– ئەو ووشە لێکدراوانەی هیچ بزوێنێکیان نییە بۆ بەستیانەوە و لەتەك یەك دانراون وەك :

( سەر ئێشە، سەرباز، دار فرۆش، پیاو کوژ، بەرگ درو،و، رۆژ نامە ) (١١) .

## ٢- یاسای دوالێکسیکییەکان Post Lexical ruler:

یاسا دوا لێکسیکییەکان لە چوارچێوەی گرێ دا کاردەکات کە یاسایەکی فۆنۆلۆجی رێکوپێکە و لە هەموو ئەو شوێنانەی کە مەرجی یاساییان تێدایە پیادەدەکرێن، وەك :

– پیاو+ ەکە + ان

یاسایەکی فۆنۆلۆجییە و رۆنانی ژێرەوەیان گۆناکرێت، دەبێت یاسایەکی بەدوادابێت شێوەی گۆکردنی وشەکە دیاریبکات، کە جگە لە خستنەپاڵ کرتاندنی بەدواوە دێت :

پیاوەکان

یاسای مۆرفۆلۆجی : پیاو + ەکە + ان

یاسای فۆنۆلۆجی (کرتاندنی دەنگ) : پیاو + ەك + ان

یاسای فۆنۆلۆجی تەنها دەنگەکان رێکناخات، بەڵکو ئاوازە و هێزیش دیاریدەکات، لە یاسا دوا لێکسیکییەکان پاش دروستبوونی وشە کار دەکات، بۆ نموونە وشەی ( پێش ) کاتێك لەگەڵ (مەرگە) دێت دەبێتە ( پێژ )، یاساکە تا

رادەیەك رێکە ( هەموو دەنگێکی خشۆکی کپ، دەنگی ژێداری وەك : ( م ، ن، ت، ....هتد ) دەگۆرێت وەك ئەم نموونانەی خوارەوە :

- پاش + نوێژ : پاژنوێژ
- پێش + مەرگە : پێژمەرگە
- دەست + گیران : دەزگیران

## ٤- یاسا فۆنۆلۆجییەکانی لێکدانی کەرستەکان :

لێرەدا پێویست دەکات بچینە سنووری رسەسازی بە تایبەتی گرێ تاکو شوێن و چۆنیەتی رێزبوونی مۆرفیمەکان Morpheme Ordering ئەم پۆلە فۆرمانە بزانین :

### أ- رێزبوونی پۆلە فۆرمەکان لە گرێی ناوی دا :

رۆنانێکە لە ناوێك یان زیاتر و راناوێك یان زیاتر پێکدێت، کە سەرەی پێ ئەڵێن و فراوان ئەکرێت بە چەند شوێن کەوتویەك، شوێنکەوتووەکان رێزبوونێکی فراوانیان هەیە ناتوانرێت سنورێك بۆ ئەوە دابنرێت، کەوا چەند لەو شوێنکەوتووانە دەشێت لە تاکە گرێیەکی ناوی دا هەبن .

- ئازاد هات .
- ئازاد و رزگار و ئاواز و ئاهەنگ و...دەبینم.
- من کتێبەکە بۆ ئازاد و رزگارو ئاواز و ئاهەنگ ....دەنێرم.

بوونی (سەرە Head ) بە مەرجی سەرەکی گرێیە و پێوەندەکانی تر کەرەستەی بە ئارەزوون وەك لەم هێلکارییەدا روونکراوەتەوە:



- ئەم دوو پیاوە زۆر ئازایانە......
- دوو پیاوە زۆر ئازاکان.....
- پیاوێکی زۆر ئازا......

ناو (ناوکی) گرێی ناویە و دەبێ لە ڕستەدا هەبێت، بەڵام ئامرازی نیشانە و ژمارە و ئاوەڵناو و رادە دەشێ نەبن و دەرنەکەوتنیان کار لە ڕێزمانیەتی ڕستەکە ناکات .

## ١- (ەکە) ناسیاوی

بەئاسانی هەست بەوە دەکەین کە مۆرفیمی (ەکە) ی ناسیاوی زیاتر لە ئەلۆمۆرفێکی، هەیە، چونکە لە هەندێ شوێن دا دەبێ بە ( یەکە یان و کە یان ێکە یان ەك) وەك لەم نمونانەدا دیارە:

- پیاوەکە ـ ژنەکە
- چرایەکە ـ زاری هەولێر . واتا (ی) لە زاری هەلێریدا زیاد دەبێ
- خانوەکە ـ زاری سلێمانی. گۆرانی (ی بۆ.و) لەزاری سلێمانی دا.
- قاپێکە ـ زاری سلێمانی
- چراکە ، تورەگەکە (١٢)

لە کاتی زیادکردنی (ەکە) لەسەر ناو ئەوا بەم شێوەیە گۆڕانکاری لەسەر ناوەکە ڕوودەدات :

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (ا ـ ۆ ـ ێ) بێت ئەوا بەم شێوەیە سەرەتای (ەکە) تێ دەچێ ، یاخود لە نێوان ناو و نیشانەکەدا (ی) ی نیمچە بزوێن پەیدا دەبێ وەك :

( ا ): هەوا + ەکە = هەوا کە

( ۆ ) : برۆ + ەکە =برۆ کە

( یٚ ) : تریٚ + کە = تریٚ کە

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێن (ی) بێت، ئەوا هەرچەندە بە زۆری لەنێوان نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (ی) سەرهەڵ دەدات، بەلاّم حالەتی توانەوە (ی) یاخود بوونی بە (یٚ) دەبینریٚ، وەك :

- شایی + ەکە = شایی یەکە
- تێچونی (ی) لە = کانیەکە
- بوونی (ی) بە (یٚ) = نانچیٚ کەی .

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (وو) بێت ئەوا لە نێوان ناوەکە و نیشانەکەدا (و) ی نیمچە بزوێن پەیدادەبیٚ وە (وو) کەمێك کورتر دەوترێت وەك :

- ئارەزوو + ەکە = ئارەزووەکە

ئەگەر ناوێك بە (ە) ی بزوێن کۆتایی بێت ئەو کاتە یەکێك لەو دوو بزوێنە (ە) ی سەرەتایی یاخود کۆتایی ووشەکەتیٚ دەچیٚ و یەکێکیان دەمێنیٚ وەك :

- شوشە + ەکە = شوشەکە

لەکاتی زیاد کردنی (ەکە) بۆ ناوی کۆ لەم بارەدا (ا) و (ە) دەکەونە پالّ یەك وەك :

- شەهید + ەکە + ان = شەهیدەکان
- ئەستێرە + ەکە + ان = ئەستێرەکان
- بەڕوو + ەکە + ان = بەڕووەکان

بەلاّم ئەگەر بێت و نیشانەی ناسیاوی (ەکە) بە ئاوەڵناو بلکێنریٚ ئەوا لە جیاتی (ی ، یٚ) دەچێتە سەر ناوەکە وەك :

- کچە جوانەکە
- کوڕە زیرەکەکە (١٣) .

### ٢- (ێك) ی نه ناسیاوی :

له کاتی خستنه سەری نیشانەی نه ناسیاویك دا بۆ سەر ناوێك ئەوا بەم شێوەیە گۆڕانکاری ڕوودەدات لەسەر ناوەکە :

أ- ئەگەر ناوێك کۆتایی به بزوێن هاتبێ ئەوا هیچ زیادی و کەمیەك لەسەر وشەکە ڕوونادات وەك :

- وڵات + ێك = وڵاتێك

ب- ئەگەر ناوێك کۆتایی به هەر دەنگێکی بزوێن بێت ئەوا، نیمچە بزوێنی (ی) پەیدا دەبێت وەك :

- پادشا + (ی) + ێك = پادشایێك
- دێ + ی + ێك = دییێك
- ڕێوی + ی + ێك = ڕێوی ێك
- جێ + ێك = جێێك
- ئەنگوستیله + ێك = ئەنگوستیلەیێك

له ناوچەی سلێمانیدا (یەك) بەکاردێ :

- دەریا + ێك = دەریایەك
- هەڵۆ + ێك = هەڵۆیەك
- ڕێ + ێك = ڕێ یەك
- هێشوو + ێك = هێشوویەك
- کانی + ێك = کانی یەك
- پەپوله + ێك = پەپولەیەك (١٤) .

### ٣- (ان) ی کۆ :

هەروەك دەزانین (ان) ناو کۆ دەکاتەوە، بەڵام هەندێکجار له جیاتی (ان) ئەمانەش بەکادێ ( ات . هات ، جات ، گەل ) ئەمانەش ئاماژە بۆ (کۆ) دەکەن و

ناو کۆ دەکەنەوە. مۆرفیمی کۆ لە کوردیدا پێکهاتووە لە (ان) یان (یان) لە هەندێ فۆرمیشدا (ات ، هات ، گەل ، جات) وەك لەم نموونانە دەردەکەوێ:

- ان / پیاوان
- یان / برایان
- جات / میوەجات
- گەل / کورگەل

لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە: ئایا هەموو ئەم شێوانەی سەرەوە دەتونرێ بە ئەلۆمۆرفیمی (ان) دابنرێ ؟

هەندێ لە زمانەوانان یەکەم و دووەم بە ئەلۆمۆرفیمی دادەنێ ، چونکە یەك ئەرکیان هەیە لە ڕوی فۆنەتیکەوە لەیەك دەچن و گۆڕانی (ان) (یان) بە هۆی یاسایەکی فۆنۆلۆجیەوە لێکدەدرێتەوە و هەندێکی تر کۆمەڵەی یەکەم و دووەم و سێ یەمیش بە یەکەوە دەبەستن و هەموویان بە ئەلۆفۆرمی (ان) دادەنێت پێیان وایە ئەلۆمۆرفی گۆڕاون، هەر لەبەر ئەم هۆیانەی سەرەوە (١٥)، ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێن بێت ئەوا (ان) بەڕەوانی پێوە دەلکێنرێ بێ زیاد و کەم وەك :

- ژن + ان = ژنان

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێنی (ا - ۆ - ێ - ی) بێت ئەوە لو نێوان ناو و ناونیشانەکەدا (ی) نیمچە بزوێن پەیدا دەبێ وەك :

- برا + ان = برایان
- پەڕۆ + ان =پەڕۆیان
- پێ + ان = پێ یان
- صۆنی + ان = صۆنی یان

ئەگەر ناوێك کۆتایی بە بزوێن (وو) بێت ئەوا لە نێوان ناوەکە و نیشانەکەدا نیمچە بزوێنی (و) دێتە کایەوە، هەروەها بزوێنی (وو) ی کۆتایی ووشەکە کەسێك لەباری

ئاسایی کورت تر دەوترێ وەك :

- بەڕوو + ان = بەڕوان

ئەگەر ناوێك کۆتایی بزوێنی (ە) بێت ئەوکاتە (ە) ی کۆتـایی ناوەکـە تـێ دەچـێ وەك :

- بەڕە + ان = بەڕان

ئەگەر ناوێك (ەکە) ی مـۆڕفیمی ناسـیاوی پێـوەبێ دەتوانـدرێ (ان) ی نیشـانەی کۆی بخرێتە سەر وەك :

- کوڕ + ەکە + ان =کوڕەکان (١٦) .

## ٤- ئامرازی نیشانە :

ئامرازی نیشانە ئاماژە بۆ شت و کەس دەکـەن بۆیـە بـەردەوام لەگـەڵ نـاودا دەر دەکەون بەم جۆرە دەبن بە دووبەشەوە و لێکدەترازێن :

- ئەم ـ ە　　　　- ئەم ـ انە

- ئەو ـ ە　　　　- ئەو ـ انە

ناو و هەموو ئەوانەی لەگەڵی دا دەردەکەون دەکەونە نێوان ئـەم دوو بەشـانەوە (نیشانە) و (ەکە) و (ێك) هەرگیز لەگەڵ یەکتر دەرناکەون.

گرێ لە کوردی دا یەك جار ئامرازی کۆی دەچێتە سەر. لەگەڵ ئامرازی نیشانە نـاو و ئاوەڵناوەکـان بـەهۆی ئـامرازی بەسـتن (ە) لێکـدەدرێن وەك لەگـەڵ (ەکـە) دا، چـونکە ئـامرازی نیشـانەش چـەمکی پێناسـین دەگەیـەنێ و بۆیـەش یـەکتر رەتدەکەنەوە .

بەم پێیە دەتوانین چەندین شێوەی ڕیزبوونی مۆڕفیمی بەند لە گرێی ناویدا بـە چەندین شێوە بخەینە ڕوو وەك :

- سەرە + ناسیاوی　　　　وەك : گوڵەکە

- سەرە + نەناسیاوی　　　　وەك : گوڵێك

- سەرە + نیشانەی کۆ وەك : گوڵان
- سەرە + ناسیاوی +کۆ وەك : گوڵەکان
- سەرە + نیشانەی کۆ+ نەناسیاوی +ان +ێك وەك : رۆژانێك
- سەرە + ئاوەڵناو +ەکە وەك : پیاوە مەزنەکە
- سەرە + ێك وەك : جوانێك
- سەرە + ان وەك: جوانان
- سەرە +ەکان وەك: مەزنەکان
- سەرە +ەکە وەك : نووسینەکە
- سەرە + چاوگ +ەکان وەك : نوسینەکان
- سەرە+ ناو +ناو +ناو وەك : شارا و سانا و سەهەند
- سەرە+ئا+ئا+ئا وەك:گەورە و بچووك و ورد و پیر و
- سەرە+چاوگ+چاوگ+چاوگ +چاوگ وەك: ئاخاوتن و نووسین ...

................هتد (١٧) .

### ب- ریزبوونی پۆلە فۆرمەکان لە گرێی کاردا :

ناوکی گرێی کاری لە زمانی کوردیدا لە رەگی فرمان و راناوێکی لکاو پێکدێت ریزمانی کوردی دوو ڕەگی جیاوازی بۆ فرمان دەست نیشان کردووە، ئەوانەی کە پێیان دەوترێت ڕەگی رابردوو ، ڕەگی داهاتوو ،.....هتد. هەموو کاتە ریزمانیەکان بەم دوو رەگە دادەرێژرێت، بەڵام لە ڕاستیدا هەر یەك ڕەگ هەیە، لە چاوگ وەردەگیرێت.لابردنی (ن) ی چاوگ کاری رابردوومان دەست دەکەوێت. لابردنی بە نیشانەکانی کاتی رابردوو ( ڕەگ) مان دەست دەکەوێت . وەرگرتنی رەگی داهاتوش چەندیاسایەك دەست نیشان کراوە پەیوەندی مۆرفۆلۆجی نێوان رەگی ریردوو و داهاتوو روون دەکاتەوە (١٨) .

گرێ ی کاری ئەرکی گەورە و دیار کراو دەبێت لە سازدانی ئەوەی لە گرێی ناویدا باس کراوە لەبارەی دەرکەوتنی هەندێکجار لە ئاستی سەرەوەدا، ئەم دیاریدەیە لە گرێی کاریدا بەدی ناکرێت بە وتایەکی تر گرێی کاری لە جۆرەکانی تر گرنگترە لە بواری سازدانی رستە دا ناتوانرێت وازی لێبهێنرێت، چونکە رستە بە بێی گرێی کاری دروست نابێت .

لە گرێی کاری تیایدا مۆرفیێمی رەگی کار مۆرفیمێکی تەوەرەییە (سەرەیە Head) مۆرفیێمە بەندەکانی تری بۆ دەگەرێتەوە، کە هەر یەك ریزبوونێکی دیاری کراو تایبەت بە خۆیی هەیە، رێزمانی کوردی دوو رەگی جیاوازی بۆ فرمان دەست نیشان کردووە، ئەوانەی کە پێیان دەوترێت رەگی رابردوو، رەگی داهاتوو،...هەموو کاتە رێزمانیەکان بەم دوو رەگە دادەرێژرێت، چاوگ کراوە بە سەرچاوە کە لێیەوە رەگی لێوەردەگیرێت. رەگی رابردوو لابردنی (ن) ی چاوگ، رەگمان دەست دەکەوێت، بۆ وەرگرتنی رەگی داهاتووش چەند یاسایەك دەست نیشان کراوە پەیوەندی مۆرفۆلۆجی نێوان رەگی رابردوو و داهاتوو روون دەکاتەوە (19) ، پێوەندەکانی گرێی کاری پێکهاتوون لە دوو بەش بەشێکیان بە سەرەتاوە دەلکێن پێی دەوترێت (پێشکار) و بەشەکی تری بە دواوە دەلکێن و پێی دەڵێن (پاشکار) وەك لەم هێلکارییەدا خراوەتە روو:

**پێشکار + نەرێ + بەردەوامی (رەگ) + تێپەڕاندن + نادیاری + کات + دووپاتی + پاشکار**

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەڵ | | | | | | ا | |
| رۆ | | | | | | ت | |
| دا | | | | | | د | |
| را | نا | | | | | ی | |
| واز | نە | دە | | | | و | |
| دەر | مە | ب | رەگ | اند | ر | ێ | موە |

بۆ نموونە : نەمدەخوارد.

نە+م+دە+خوار+د = نەرێ + راناوی لکاو+ بەردەوامی+رەگ+ کات

لەگەڵ هەر مۆرفیمێکی بەند جۆرە ریزکردنێك هەیە ئەمەش بە پێی جۆری رەگ و مۆرفیمەکان دەگۆرێت. وەك : هەڵدەدرێتەوە .



پێکهێنەری سینتاکسی هەر ڕستەیەك لە دوو ئاستدا دەبێت ئاستی سەرەوە بۆ چۆنییەتی گۆکردنی ڕستەیە کە ڕاستەخۆ بە فۆنۆلۆجیمان دەبەستێتەوە و گەلێ گۆڕانکاری ڕوودەدەن لە لێکدانی مۆڕفیمەکان بۆ دروستکردنی دانەی گەورەتر کە گرێ و ڕستەیە، ئاستی ژێرەوەش، کە بریتییە لە پەیوەندییە ناوخۆییەکانی نێوان کەرستەکانی ڕستە بۆ لێکدانەوەی واتای ڕستەیە، چونکە پەیوەندی واتایی نێوان ڕستەکان نیشاندەدات بنجی پێکهێنەری سینتاکسی لە دوو بەش پێکدێت (پێکهێنەری پۆلی و فەرهەنگ) پێکهێنەری پۆلی بریتییە لە سیستەمی یاساکانی دووبارە نووسینەوەی ڕستە کە دوو ئەرکییان هەیە :

١- دیاریکردنی پەیوەندییە ڕێزمانییەکانی نێوان وشەکانی ڕستە.

٢- دیاریکردنی چۆنییەتی ڕێزبوونییان لە ئاستی ژێرەوەدا .

مەبەست لە فەرهەنگیش کەرەستە فەرهەنگییەکانە کە کە هەڵگری هەموو ئەو زانیارییانەن کە پێکهێنەری فۆنۆلۆجی و واتایی لە ڕێزمان و لایەنی گوێزانەوە لە پێکهێنەری سینتاکسیدا پێویستییان پێدەبێت، هەروەها هەڵگری ئەو زانیارییانەن کە شوێنی دروستی وشەکان لە ڕستەدا دەستنیشان دەکات ئەم بیرەی چۆمسکی کە بە تیۆری ستاندەرد ناسراوە لە ساڵی (١٩٦٥) بڵاوکرایەوە لە ژێر ناوی (چەند لایەنێکی تیۆری پێکهاتی سینتاکی کە دوای ڕەخنەکانی کاتز و فۆدەر هات کە لەم هێلکارییەدا دەیخەینە ڕوو (٢٠) :




بەمەش هەر سێ ئاست ( فۆنۆلۆجی و وشەسازی و سینتاکس ) ئاوێتەی یەکتر دەبن .

## پەراوێزەکانی بەشی چوارەم :

١- (وریا عومەر ئەمین:٢٠٠٤:٧٦).
٢- (ئەو رەحمان حاجی مارف: ١٩٧٩: ١٤٩٠)
٣- (وریا عومەر ئەمین:٢٠٠٤:٧٨)
٤- (وریا عومەر ئەمین:٢٠٠٤:٧٦)
٥- (دەروون عەبدولرەحمان:٢٠١٠:٤٦).
٦-(دەروون عەبدولرەحمان:٢٠١٠:٤٨).
٧-(ئەورەحمان حاجی مارف: ١٩٧٩: ٢٠٩)
٨- (وریا عومەر ئەمین:٢٠٠٤:٧٧).
٩- ( وریا عومەر ئەمین : ٢٠٠٤:٢٨٤)
١٠- ( ئەورەحمانی حاجی مارف:٢٠٠٤:٤١٣)
١١- ( محمد معروف فتاح: ١٩٨٠: ٧-٨ )
١٢- (مەحەمەد مەعروف فەتاح : ١٩٩٠ : ٧١-٧٢)
١٣- (ئەورحمان حاجی مارف : ١٩٧٩ : ٢٠٧ تا ٢٠٨)
١٤- (ئەورەحمان حاجی مارف : ١٩٧٩ : ٢٠٩)
١٥- (مەحەمەد مەعروف فەتاح : ١٩٩٠ : ٧٢-٧٣).
١٦- (ئەو رەحمان حاجی مارف : ١٩٧٩ : ١٤٩٠) .
١٧- (کوردستان موکریانی :٢٠٠٠: ١٢)
١٨- ( وریا عومەر ئەمین:٢٠٠٤:٢٠٦) .
19- ( وریا عومەر ئەمین:٢٠٠٤ :٢٠٦)
٢٠- عەبدولواحید موشیر دزەیی :٢٠١١:١٦٧)

## سەرچاوەکان :

### أ- بەکوردی :

١- ئاورەحمانی حاجی مارف (٢٠٠٤) ، فەرهەنگی زاراوەی زمانناسی، سلێمانی
٢- ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٧٩)، مۆرفۆلۆژی (ناو)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا .
٣- ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٨٧) ، ووشە رۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپی دووەم.
٤- ئەورەحمانی حاجی مارف (١٩٩٢)ڕێزمانی کوردی، بەگی یەکەم، ووشەسازی ئاوەڵناو، بەغدا .
٥- دەروون عبدالرحمن سالح (٢٠١٠) ئیکۆنۆمی لە ئاستەکانی زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر،بەشی کوردی،کۆلیژی زمان،زانکۆی سلێمانی.
٦- زێرین خورشید سەلیم (٢٠١٢) ئەلۆمۆرف د زمانێ کوردیدا، خانەی سپێرێز بۆ چاپ و بلاوکردنەوە، دهۆك .
٧- صادق بهاءالدین (١٩٨٧)، رێزمانی کوردی، کرمانجی یاژۆری یاژێری یا هەڤبەرکری، دار الشوؤن الثقافیة العامة، بەغداد.
٨- صەباح رەشید قادر (٢٠٠٩) تیۆری مۆرفیم و هەندێ دیاریدەی وشەسازی کوردی، گ، زانکۆی زانسە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.
٩- عەبدولواحید موشیر دزەیی (٢٠٠٥) رەهەندی دەروونی لەبواری راگەیاندندا، چ/١ هەولێر.
١٠- عەبدولواحید موشیر دزەیی(٢٠١١) زارە کوردییەکان ، چ/١، چاپخانەی ماردین، هەولێر .
١١- عەبدولواحید موشیر دزەیی (٢٠١٢) لێکسیکۆلۆجی، چ/١، چاپخانەی ماردین، هەولێر.

١٢- عەبدولواحید موشیر دزەیی (٢٠١١) واتاسازی وشە و ڕستە، چ/٢، چاپخانەی ماردین، هەولێر.

١٣- ك.ك.کوردۆیف (١٩٨٢)، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەکەرستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، وەرگێرانی لە ڕووسیەوە:د.کوردستان موکریانی، هەولێر .

١٤- کامل حسن بصیر (١٩٧٩) زاراوەی کوردی،لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن، بڵاوکراوەکانی زانکۆی سلێمانی.

١٥- کوردستان موکریانی (١٩٨٤) سنتاکسی رستەی سادە لەزمانی کوردی دا، وەزارەتی رۆشنبیری وراگەیاندن، زنجیرەی ١٣٢

١٦- کوردستان موکریانی (١٩٨٦) سنتاکسی رستەی سادە لەزمانی کوردی دا.

١٧- لێژنەی دەستووری زمانی کوردی (١٩٨٥) هەندێ لەبابەتە کێشەدارەکان کۆڕی زانیاری عێراق، بەغدا.

١٨- لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ (١٩٧٦)، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەغداد.

١٩- لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە (٢٠٠٥)، زمانو ئەدەبی کوردی پۆلی یەکەمی ناوەندی، بەغداد.

٢٠- محەمەد مەعروف فتاح (١٩٨٩ )، کار پۆلین کردن بەبێ ڕۆنان، گۆڤاری رۆشەنبیری نوێ ژمارە١٢١ .

٢١- مەحەمەد مەعروف فەتاح، صباح رەشید قادر (٢٠٠٦) چەند لایەنێکی وشەسازی کوردی، بڵاوکردنەوەی بەشی روناکبیری، چاپخانەی روون .

٢٢- مەسعود مەحەمەد (١٩٧٦)، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، لە کۆڕی زانیاری کورد .

٢٣- محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٨٠)، دەربارەی هێز لە زمانی کوردیدا، وەرگێڕانی: ئازاد حەمە شەریف : On The Stress System of kurdish

٢٤- محمد أمین هەورامی (١٩٨١) زاری زمانی کوردی لە تەرازوی بەراود دا، مکتبە وطنیة بغداد.

٢٥- محمد معروف فتاح (١٩٩٠) زمانەوانی، زانكۆی سەلاحەدین، هەولێر.

٢٦- محمد معروف فتاح (١٩٩٢) باس لەجۆریك لەرستە، گ.رۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٨)، بەغدا.

٢٧- نەسرین فەخر و كوردستان موكریانی (١٩٨٢) ڕێزمانی كوردی،چاپخانەی زانكۆی سەلاحەدین

٢٨- نوری عەلی ئەمین (١٩٦٠) ، ڕێزمانی كوردی، سلێمانی .

٢٩- هیدایەت عەبدوڵڵا محەمەد (٢٠٠٢) ڕێكەوتنی واتایی ناو ئاوڵناو لە زمانی كوردیدا، نامەی دكتۆرا، زانكۆی سلێمانی.

٣٠- وریا عمر أمین (١٩٨٩) ئەلۆمۆرفی ڕێزمانی، رۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٢٢)، بەغدا.

٣١- وریا عمر أمین (١٩٩٤) هێزوئاوازە، رۆشنبیری نوێ، ژمارە(١٣٤).

٣٢- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٤) ئامرازەكانی بەستن، گۆڤاری رۆژی كوردستان، ژمارە ٦٧.

٣٣- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) ، بناغەی سادەترین ڕستەی كوردی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١١، بەغدا .

٣٤- وریا عومەر ئەمین (١٩٨٦) مردنی وشە، گۆڤاری كاروان ژمارە،٤٥ .

٣٥- وریا عومەر ئەمین (٢٠٠٤)، چەند ئاسۆیەكی تری زمانەوانی، بەرگی یەكەم، چاپخانەی ئاراس، هەولێر .

٣٦- یوسف شریف سەعید (١٩٩٩) ڕادەو هەندێ تێبینی دەربارەی ڕادە لە زمانی كوردیدا، گ،زانكۆ بۆ زانستە مرۆڤایەتیەكان سالی/٣ ژمارە (٤)، زانكۆی سەلاحەددین .

**ب- بە عەرەبی :**

١- جوررج فندریس (١٩٥٠ ) اللغة، ت، عبدالحمید الدواخلي، محمد القصاص، كتبة انجلو المصرية، القاهرة.

٢- حسن جمعة (٢٠٠٢) في جمالية الكلمة، دراسة جمالية بلاغية نقدية، من منشورات اتحاد الكتاب العرب، دیمشق

٣- ستيفن اولمان (١٩٨٦) دور الكلمة في اللغة،ترجمة،كمال محمد بشير، مكتبة شباب. بغداد.

٤- عادل محمد عبدالرحمن الشنداح (٢٠٠٧) وقف في الدلالة الصرفية، جامعة بغداد، كلية العلوم الاسلامية، قسم اللغة العربية .

٥- عبدالعزيز حمودة، الخروج من التيه، دراسة في سلطة النص، منشورات عالم المعرفة، ٢٠٠٣,

٦- لطفي عزيزة الامين (٢٠١٠) المورفيم لافعال الثلاثية المجردة و المزيدة في مجموعة قصصية ( الزوجة العذراء ) لقماشة العليان، دراسة تحليلية صرفية، جامعة مولانا مالك ابراهيم الاسلامية الحكومية، مالانج، اندنوسيا .

٧- ماريو پاى (١٩٩٨) اسس علم اللغة، ترجمة و تعليق: احمد مختار عمر، الطبعة الثامنة، عالم الكتب، القاهرة .

٨- محمد خير حلواني (د.ت) المغني الجديد في علم الصرف، لبنان، بيروت، دار الشرق العربي .

٩- محمد على الخولى (١٩٩١) معجم علم اللغة النظرى انكليزى- عربى- بيروت، لبنان.

١٠- محمد على الخولى (٢٠٠٠) مدخل الى علم اللغة، دار الفلاح للنشر و التوزيع، الاردن .

١١- محمد محمد يونس (١٩٩٣) وصف اللغة العربية دلاليا، فى ضوء مفهوم الدلالة المركزية، دراسة حول المعنى و ظلال المعنى، منشورات جامعة الفاتح، ليبيا.

## ج- بە ئینگلیزی :

1- Ba'albaki, Ramzi Munir. (1990) Dictionary of Linguistic Terms. English-Arabic Beirut: Dar El-llmLilmalyin.
2- Bloomfield, L. (1933),Language Holt, Rinehart&Winston. New York.
3- Cooper. D. (1973) "Philosophy & the nature of language, Longman.
4- Crane, L.b Yeager,E,Whitman,R.L(1981) An introduction TO linguistics. Little Brown & Company.Canda.
5- Cruse,O.A.(1991)"Lexical Semantics Cambridge University, press, Great Britain.
6- Dowty, David. (1972).Studies in the Logic of Verb Aspect and Time Reference in English.(Ph.D. Thesis), The University of Texas at Austin
7- Fattah,M,M.(1980) On The Stress System of kurdish, Zanko.The Scientific Jorurnal of Sulaimaniyah University.Vol:6,No,2,Sep. .

8- Greenberg Joseph, H (1961) Essays in Linguistics. The university of Chicago press. London.
9- Langacher,R.W (1973) Language&its structure.Harcourt Brace Jovanovich inc.U.S.A.
Linguistics,Georgetown University. Washington D.C
10- Leech,G.(1974) "Semantics" Great Briton , London
11- Lyons, J. (1977) "Sementics" Cambridge University Press,London& New York. .
12- Lyons, J. (1977) introduction theoretical linguistics, Cambridge University Press,London& New York.
13- Robins, R.H (1978) General linguistics: An introductory survey 2nd.endn Longman, London(Ist edn 1964)
14- Walter Cook ( 1981) An Introduction to Generative Semantics, (Unpublished classroom Lectures), Department of

**د- ئەنتەرنێت :**

١- مفهوم الكلمه:

http://www.aklaam.net/newaqlam/index.php?option=com_

٢- مورفولوجيا :

http://www.ta-u.com/vb/archive/index.php/t-218303.html

٣- اجتماع خبراء المحللات الحاسوبية الصرفية للغة العربية دمشق ٢٦-٢٧/٤/٢٠٠٩

www.comp.leeds.ac.uk/sawalha/sawalha09alecso.ppt

٤- علم مورفولوجيا: http://www.onefid.edu.duz

٥- Lexical Morphology

http://ifla.uni-stuttgart.de/institut/mitarbeiter/jilka/teaching

٦- Morphological and Lexical Contrastive Analysis of Turkish and English

https://globaljournals.org/GJHSS_Volume12/4-Morphological-and-Lexical-Contrastive.pdf